# ڕاستینەی نەتەوایەتیمان

# لەگەڵ ڕاستینەی ژن و ژیان هەڵدەسەنگێنرێت

مەزنترین ژنانی مێژوو لەم خاکەدا, ( واتە لەمیزۆپۆتامیا ) دەرکەوتوون, ئێمەش بەدوای ئەوانەوەین و لەسەر ڕێچکەیان دەڕۆین. ئێمە جولآنەوەی وەرچەرخان و گەڕانەوەین بۆ مێژوو و ئەشق, بۆلەناوبردنی خراپییەکان بەڕێ کەوتووین. ئەوروپاییەکان هەرچەند دەکەن تێناگەن " کە ئەم پیاوە لەشوێنێکی وەکو خۆرهەلآتی ناوین, کە تا دوایی دەستەڕۆیی تێدا باوو زاڵە, چۆن ئەم ئازادییە مەزنە دەخولقێنێ؟ " بەگوێرەی ئەوان قیبلەی ئەمجۆرە خەبات و تێکۆشانانە پاریس, نیۆیۆرك و لەندەنە, ئەم کین و نەفرەتەی بەرامبەر بە من و PKK هەیانە سەرچاوەی خۆی لەم ڕاستییە وەردەگرێت. واتە دێنمەوە یادیان کە ئێوە سەنتەر و مەڵبەندی شارستانیەت و بەکۆمەڵگابوون نین و سەنتەری جوانیش نین, تەواوی ئەمانە لای ئێمەیە, لەبەرئەوەی تاڕادەیەك ئەم ڕاستیەیان دێنمەوە یاد, توڕە دەبن و ڕقیان ئەستوور دەبێ. بەرامبەر بەئەوروپا شکستمان نەهێنا و بێگومان کاریگەریم بەسەر ئەوروپاوە کردووە.

سەنتەری خوداوەندی ئەشق و شارستانییەت میزۆپۆتامیایە, هیچ کەسێك و هیچ شوێنێك هێندەی ئەم خاکە بەشێوەیەکی ئازاد بیری نەکردەوە و بەشێوەیەکی ئازاد خولقاندن و داهێنانی ئەنجام نەدا و بەشێوەیەکی ئازادانەش خۆشەویستی نەکرد و جوانی نەخولقاند. ئایا میزۆپۆتامیا ــ دۆڵەکانی زاگرۆس ــ یەکەمین جێگا و شوێن نییە کە کشتوکاڵ و چاندنی لێ ئەنجامدرا و یەکەمین شارستانییەت تێدا گەشەی سەند و یەکەمین شوێنی نیشتەجێی مرۆڤایەتی لێ ئاواکرا و لێی نیشتەجێ بوو؟ ئایا یەکەمین شوێن نییە کە هەڤاڵێتی تێدا گەشەیسەند و پێشکەوت؟ ئایا ئەمە جۆش و خرۆش بەمرۆڤ نابەخشێ؟ بۆچی ئەم مێژووە نابینرێت؟

چەمك و چالاکیمان ئەوەیە. بۆئێمە مێژوو ئەمەیە و بەمجۆرەش مەزنایەتی بەدەست دێنین.

ئێستاش لەبیرمە هەندێ کچ هەبوون کە سەرنجیان ڕادەکێشام, تەنیا یەك وشە چییە نەمگوت و نەمدرکاند, چونکە باوەڕیم هەبوو کە لەڕێگای شەڕ دەخولقێنرێن. ئێستا بچمە هەرشوێنێك هێزی ئەوەم هەیە کاریگەری بەسەر دەورووبەرم بکەم, بەسەر کۆیلایەتیدا دەچم و دەیپلیشێنمەوە و ئازادی دەردەخەمە مەیدان. ئەوەی پەیوەندی و مەیلێکی بەرزیان لەگەڵ ئەم ڕاستینەیەدا هەبێت دەتوانن لەگەڵمدا بەڕێوەبچن, ئەوەی ئەم پەیوەندی و مەیلەی نەبێ ناتوانێ بەڕێوە بچێ و لێم دوور دەکەوێتەوە و دەڕوات.

خاوەندارێتی لەمیزۆپۆتامیا دەکەم و, تا دوارادە لەگەڵ دروشمی بەرخۆداندا و گرێدراوی میزۆپۆتامیاین. ئەمەش سەرکەوتنی میزۆپۆتامیایە.

**أ ــ ژن لەقۆناخەکانی پێشکەوتنی مێژووی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی**

هەروەکو دەزانرێ کۆمەڵگا لەسەر بنەمای پەیوەندی نێوان ژن و پیاو دەستیپێکرد. لێرەدا باس لەتایبەتمەندییە سروشتی و ئاساییەکان ناکەین. بێگومان پێشکەوتنی پەیوەندییەکانی ژن ــ پیاو رۆڵێکی مەزنی لەشێوەگرتنی نوێی کۆمەڵگادا هەیە و بناخەکەی پێکدێنێ.

ئایدیۆلۆژیا لەقۆناخە سەرەتا و یەکەمینەکانی رێکخستنی کۆمەڵگادا بەشێوەیەکی سەرەکی لەبازنەی ژندا خولاوەتەوە و مۆرکی ژنی پێوە بووە. ئەوەی پیاویشی لەنێو ریزی ئاژەڵەکاندا دەرخستووە هەر ژن بووە. ئەوەی بۆجاری یەکەمین کۆمەڵی خولقاند ژن بوو و ئەوەی بۆجاری یەکەم کۆمەڵگاشی پێشخست هەر ژن بوو. سەرەتا پیاو لەناو ژیانێکی هۆڤێتیدا دەژیا, واتە هۆڤ بوو. بەڵام ژن کۆمەڵگای خولقاندووە و فێری چۆنێتی بەدەستهێنانی خۆراك و خواردەمەنی بووە و ئاگری دۆزیوەتەوە و ژیانێکی کۆمەڵکاری پێشخستووە و هێزێکی هەرەوەزی و کۆمەڵکاری دۆزیوەتەوە, هەربۆیە ژن بەهێزە. لەبەر ئەوەی بەشێوەیەکی کۆمەڵ و ژمارەیەکی زۆر لەگەڵ یەکتردا بوون, بۆیە لەپیاو بەهێزتر بوون, لەبەر ئەوەی پیاو لەنێو هۆڤەکاندا بووە, بەمجۆرە چاونەترس بووە و کاری تەنیا لێدان و شکاندن بووە.

راستینەیەکی بەمجۆرە لەمێژوودا هەیە کە: ژنان رۆڵێکی مەزنیان لەبەمرۆڤ بوونی مرۆڤایەتیدا هەبووە کە ملیۆنان ساڵی خایاندووە. ژنان ناتەواو نین, بەڵکو لەرەوشێکی تەواو و تەواوکاردان, ئەوەی لەلایەنی ژیان و بەکۆمەڵگا بووندا ناتەواوە پیاوە.

ئەو هێزەی کە کۆمەڵگای کۆمۆنەی سەرەتایی خولقاند هێزی ژنە. خوداوەندی ئەمەش عەشتارە کە تاوەکو ئێستاش لەسەر زمان و وێردی گەلان دایە " ستار "ە, ستێرێکە, ئەستێرەش لەزمانی ئێمەدا مانای دیارە. خۆی لەراستیدا یەکەمین خودا و خوداوەندە. خوداوەندە پیاوەکان دوای ئەو دەرکەوتن. واتا خوداوەندەکان ماوەیەك دواتر بەشێوەی پیاو خۆیان خستەڕوو. بێگومان تا دوارادە ئەم ڕەوشە گرێدانی خۆی بە تایبەتمەندێتی بەرهەمهێنانی ژنانەوە هەیە.

سەرەڕای ئەوەی باڵادەستی عەشتار بەدەست ژنانەوەیە, بەڵام کەسایەتی گلگامێش هێدی هێدی دەخوازێ هێز بەدەست بێنێ و شەڕ بەمجۆرە دەستپێدەکات. عەشتار ئاشق نییە بەڵکو شەڕێك روودەدات ئاکامی ئەم شەڕەش خراپ نییە, لەراستیدا کەسایەتی عەشتار خۆی بەنوێنەرایەتی و بەخاوەنی ئەشق دەبینێ, هەربۆیە عەشتار دەڵێ: "لەنێو ژیاندا نەمریش هەر لەرێی ئێمەوە دەبێت. "

لەداستانی گلگامێش بەردەوام ژن وەك فاکتەرێکی وروژاندنی شەڕ دەبینرێ و بەمجۆرە نیشاندەرێ. راست تریشە بگوترێ کەوا نیشاندەدرێ, خوداوەندەکان بەردەوام جوانی و کەسایەتی و لایەنی سێکسی ژنان سەبارەت بەمەسەلەی شەڕ دەردەخەنە پێش و بەکاری دێنن. ئەوەی لەم داستانەدا سەرنج رادەکێشێ ئەوەیە کە بەردەوام ژن هەوڵدەدات شەڕ پێشبکەوێت و بۆ ئەمە هەوڵدەدات, واتە ژنێکی بەمجۆرە نیشاندەدات. ئەمەش چەمکێکە زیاتر بەگوێرەی چەمکی باڵادەستەکانە, بەڵام لەهەمانکاتیشدا گرنگە. ئەو

راستینەیەی کە لەبەرزترین ئاستدا بەدیهاتووە ئەوەیە کە گلگامێش خواستوویەتی کەسایەتی پێویست بۆ هەموو ژنەکان نیشان بدات. ئەمەش هەڕەشە لەتەواوی ئەو سیستەمانە دەکات کە ئاوا کراون. لەلایەکی تر گلگامێش هەوڵدەدات خۆی بەباشی نیشان بدات و بپارێزێت, ئەوەی کەوتۆتە نێو تەڵەزگەش ژنە.

لەگەڵ پێشکەوتنی کۆمەڵگای چینایەتی بەشێوەیەکی دیار و چڕوپڕ, هێز لەلایەنی پیاو کۆدەبێتەوە, هەرچەندە هێزی پیاو مەزن بوو بێت و زیاتر کۆبووبێتەوە, ژنان هێزی خۆیان لەدەستداوە. دەربازبوون بۆ کۆمەڵگای چینایەتی لەبنەڕەتدا دەربازبوونە بۆ باڵادەستی پیاو. پێشکەوتنەکانی ژێر باڵادەستی پیاو هێندە سنووردار بووە, خواوەندەکانی دواتر هەموویان پیاو بوون و هیچ خواوەندێکی ژن لەئارادا نەماوە.

مێژووی کۆیلایەتی, مێژووی نایەکسانی و چەوسانەوەیە. تەواوی ئیمپراتۆرەکان پیاون, گەر بەڕادەیەکی کەم و دەگمەن ئیمپراتۆری ژنیش هەبێت ئەوانیش ژنی پیاوانەن, واتە ژنانێکن بەگوێرەی پیاوان. لە99٪ ی تەواوی فەرماندە و سیاسەتمەدارەکان پیاون, ئەمەش باڵادەستییەکی زۆر نایەکسان نیشان دەدات. بێگومان جگە لەوەی کە تەنیا پەیوەندی بەجیاوازی چینایەتی نییە, کاتێك بڵێین کە تاکە راستینەی پێشکەوتنی مرۆڤایەتییە, ئەوە گوتنێکی زێدەڕۆییە و لەجێگای خۆیدا نابێ. واتە گوزارشتی " گەر پیاو باڵادەست نەبێ, ژیان نابێ " خۆی لەخۆیدا بەواتای بەبنچینە گرتنی هزر و گۆشەنیگای چەوساندنەوە و فشار دێت.

ژنێك لەو قۆناخەدا هەبوو کە مەراقمە و ناوی " زەنوبیا " یە. شاژنێك بوو, زۆر مەراقمە. من بەچاوەکانی خۆم ئەو دەوڵەتە گەورە و سەیرەی " سیتە "م بینی. لەراستیدا چۆن بوو, چۆن ژیا و چۆن رووخا؟ وابزانم وایکردووە کە کاتێ رۆماییەکان دەستیان بەسەر شارەکەدا گرت ئەو خۆی لەدەرەوە بوو بەدوای هەوپەیمانانی دەگەڕا, کاتێ گەڕایەوە و بینی " پالیمێرا " دەسووتێ ئەویش یەکسەر زەهری خواردووە و خۆی کوشتووە. زۆر واتادارم بینی, بێگومان کاتێك " پالیمێرا " سووتا دوای ئەوە ژیان هیچ بەهایەکی نەما.

هەرچەندە هێز لەپیاودا پێشکەوت, بۆ یەکەمجار ستاتۆیەکی لەبواری پەیرەوکردن بەسەر مرۆڤدا پێشخستووە. ستاتۆ چییە؟ یان خۆی لەرێگای ئەم پڕوپاگەندانە دەسەپێنێ و پەسند دەکات کە خۆی وەك کەسایەتیەکی نائاسایی و مەعنەوی نیشاندەدات و لەرێگای پیاو و دارودەستەکانی ئەمە ئەنجام دەدات, یاخود لەڕێگای فشار و پەیڕەوکردنی چەوسانەوە, خەڵك ( مرۆڤ ) لاواز دەکات و بەخۆیانەوە گرێدەدات. قۆناخی پێشکەوتنی ئەو هێزەی لەپیاودا کۆبۆتەوە, بەمجۆرەیە. ئەمەش لەچۆنێتی هەڵوەستە کردنی بەرامبەر بە ژنان دەکەوێتە نێو بۆتە و شێوازێکی زۆر مەترسیدارەوە. بەمجۆرە هەرچەندە پیاو لەکەسایەتی خۆیدا هێزی فشار و چەوسانەوە کۆبکاتەوە, بەداخەوە هەڵوێستی بەرامبەر بە ژنان زۆر نایەکسانە و بەشێوازی کۆکردنەوە و کەڵەکە کردنی موڵك دەبێت. لەڕاستیدا ئەو ئاست و بۆتەیەی پێی گەیشتووە جێگای داخی مرۆڤە, تا دواڕادە ژنان دەخاتە نێو رەوشێکی بەندکراوی و موڵکایەتی و تا دواڕادە بچووکی دەکاتەوە. بۆ ئەوەی باڵادەستی خۆی تێر بکات تا دواڕادە ژن بێ هێز و بێ ئیرادە دەکات و تەنیا لەڕەوشی پەیکەر و روخسارێکدا دەیهێڵێتەوە. واتە دەکرێتە سەگێکی جوانی خاوەنەکەی, هەر لەبەر ئەوەی بەمجۆرە تێر دەبێت و دادەمرکێتەوە و شانازی پێوەدەکات.

لەزۆربەی زۆری ئایدیۆلۆژیاکاندا ئەم راستینەیە نەخراوەتەروو. هەر لەبەرئەوەی کە زۆربەی ئایدیۆلۆژیاکان لەسەر بنەمای باڵادەستی پیاون, پێویستی ئەوە نابینن کە لەراستینەی پیاو بکۆڵنەوە و ئاشکرای بکەن, ئەگەر کەسایەتییەکی سۆسیالیستی زۆر قووڵ لەئارادا نەبێ, پیاو هێندە رێگا بەم هزر و بۆچوونانە نادات کە باڵادەستی ئەو بخاتە نێو مەترسی و هەڕەشەی لێبکات و ناخوازێ خۆی بکاتە بابەت و رۆژەڤی رەخنەکردن. ئەمەش رەوشێکە لەپیاودا زۆر قووڵ بۆتەوە و چۆتە ناواخنیەوە.

لەلایەکیتر یەکەمین پەیوەندی و دەزگا لەگەڵ دەرکەوتنی خێزان پێکدێت و دێتە ئاراوە. شێواز و ئاستی پەیوەندییەکانی ژن و پیاو رۆڵێکی دیاریکراو لەنێو خێزاندا دەگێڕێ, هەروەها وەك قۆناخێکی بەرزتری ئەم راستینەیە خێزانی خانەدان دەردەکەوێتە مەیدان, ئیتر هێدی هێدی خێڵ و هۆز پێشدەکەون, بۆنموونە لەسەردەمی فیوداڵی: هەرچەندە هەندێ کەس " حەزرەتی محەمەد " رەخنە دەکەن, بەڵام بەگوێرەی من هەڵوێستێکی ناسك و نیان لەودا دەبینرێ. حەزرەتی محەمەد ژمارەیەکی زۆر ژنی هێناوە, کاتێك بڵێین 13 کەنیزەکی هەبوو, ئەوکاتە بەشێوەیەکی تەنگ و سنووردار خۆشەویستی حەزرەتی محەمەد بەرامبەر بەژنان دەگرینە دەست. لەهەلومەرجی ئەو کاتدا ژنان بەشتێکی کەم و عەیب دەبینران و زیندەبەچاڵ دەکران. حەزرەتی محەمەد لەلایەن خۆشەویستی ژنەوە پێشکەوتن و گەشەسەندنێکی نائاسایی هێنایە ئاراوە. لەوانەیە ئامانجی سیاسی هەبووبێت, بەڵام لەهەمانکاتدا هەروەکو دەبینرێ نرخ و بەهایەکی زۆری بەرامبەر بەژنەکانی نیشانداوە. دوایی پەرە بە حەرەم درا، عەباسییەکان و ئەمەوییەکان و عوسمانییەکان و هەتا بگرە مستەفا کەمالیش حەرەمێکی یەکجار پیسی بۆ خۆی ئاوا کردووە.

سوڵتانەکانی عوسمانی و ئەمەوییەکان شەو و رۆژ لەگەڵ ژناندا بوون، بەڵام هەریەك لەوانە بوونەتە زۆردارێك. سەبارەت بەم مەسەلەیە ئیمپریالیزم زۆر پێشکەوتووە، بگرە بۆرژوازی لەم لایەنەوە گەلێك تەگبیری جیاجیای وەرگرتووە. بەبێ ئەوەی رێگا بەئازادبوونی ژنان بدات، ژنانی گەیاندۆتە رەوشێکی وەها گێلی و نەفامی کە بڵێن:" چەندە ئازاد بووین و، ئەمە بۆ ئێمە زۆریشە". واتە چاوەکانی سواخداوە و بۆیەی کردووە. ژن بۆتە گەورەترین سەرمایە و ناسك و نیانترین کاڵا و گەمە و لەیستۆکی دەستی پیاو و کۆمەڵگا.

لێرەدا هەم چین و رەگەز لەگەڵ یەکتردا ئاوێتە بوون و بوونەتە یەك، هەم لایەنی نەتەوەییشی هەیە. خیانەتی نەتەوەیی دەبێتە هێزێکی مەترسیداری هێرش کردن. شێوازی ژنانەی " تانسۆ چیللەر" یش بەمجۆرەیە. کاتێك سەرمایە و رەگەز و شۆڤێنیزم لەژنێکدا یەکانگیر بن و ببن بەیەك, بەتەواوەتی دەبێتە هۆڤێك، یانیش پێی دەڵێن:" مێیینەی ترسناك ". شتی وەها لەڤێتنامیش رووی داوە، زۆر مەترسیدارە.

هەروەها ئەو زەمینەیەی کە تەواوی سیستەمەکانی ئیمپریالیستی و سەرمایەداری و سیستەمەکانی شەڕی تایبەت خۆیانی لەسەر پەیڕەو دەکەن و درێژە بە تەمەنی خۆیان دەدەن, زەمینەی " خێزانە ". پێویستە بەشێوەیەکی چڕوپڕ ئەمە بە بەرچاودا دەرباز بکەین و بەدژواری رەخنەی بکەین. ئەمەش بەو واتایە نایەت کە وەك گوزارشتێك نکوڵی لێبکرێت, یاخود دەرباز بکرێت و بەلاوە بنرێت. گوزارشتێکی بەمجۆرە گرنگی خۆی هەیە. دیکتاتۆرییەت و موڵکایەتی لەنێو خێزاندا هەیە، ژنان لەهەموو مافێك بێبەش و لەنێو ئێش و ئازاردان. تا بڵێی بچووك دەبینرێن و بە نەزان دادەنرێن. بەر لەهەموو شتێك لەلایەنی جەستەیی ( فیسیۆلۆژی

)يەوە كۆتاييان پێهاتووە و هیچ داواكارييەكی وا جدديان نييە. هەربۆيە باس لەسۆزدارێتی ( عاگفە ) ژنان دەكرێت. بێگومان كاتێ تەواوی هەلومەرجەكان بەم شێوەيە بن، هەڵبەتە ژن دەبێتە بوونەوەرێكی وابەستە و, دەبێتە بوونەوەرێك تەنيا لەرێی هەست و سۆزەكانييەوە بژيت و ئەمەش گەورەترين بێ رێزييە بەرامبەر بەمافەكانی مرۆڤ و گەورەترين هێرشە كە دەكرێتە سەری. هەربۆيە كاتێ بخوازين باس لەرزگاربوونی ژنان بكەين, پێويستە بەشێوەيەكی جددی و دژوار ئەم دەزگايە ـــ دەزگای خێزان ـــ رەخنە بكەين كە خنكاندوويەتی و هەناسەی لێ بڕيوە.

بۆ نموونە: بە گوێرەی شۆڕشی ئێران دەبێ دەموچاوت داپۆشرابێت, بەڵام لەهەمانكاتدا شێوازێكی سەيری پەيوەندی لەئارادايە، زۆر بەڕەڵايە و بە لای ئێمە زۆر كۆنەپەرست و پاشقەڕۆ دەبينرێ.

هەروەها لەنێو سيستەميشدا ( مەبەست لەسيستەمی توركيايە ــ وەرگێڕ ) مرۆڤ و خەڵكانی توركيا كەوتوونەتە رەوشێكی گێلی و نەزانی و، لەراستيشدا ئەمە جۆرێكی بەفاشيست كردنە. هەروەكو چۆن هيتييەكان دەيانگوت:" گەلان وەكو ژن وان " ئێستا رەوشێكی وا لەتوركيا لەئارادايە كە سيستەم وەكو مێگەڵ بكات. لەراستيشدا ئەمە لەلايەنی فاشيزمەوە دەسەپێنرێ، مرۆڤ وەكو مێگەل نييە، بەڵام فاشيزم وەكو مێگەليان لێدەكات.

لەلايەكی ترەوە تەقينەوەی پەيوەندی سێكسی لەئارادايە، هەروەكو دەزانن تايبەتمەندييەكە لەئاستێكی بەرزدا كۆت و بەندێكی كردۆتە پێی كۆمەڵگاكان, بە تايبەتيش ئەو رەوشەی لەنێو چينە چەوساوەكان باوە و لەئارادايە. لەڕاستيدا پياو و ژنێكی بەمجۆرە لەئارادا نين كە تەقينەوەيەكی بەمجۆرە بكەن, بەڵام خۆيان وا دێننە بەرچاو و خۆيان بەمجۆرە لەقەڵەم دەدەن. سەبارەت بە مەسەلەی پەيوەندی سێكسيەوە پياوێكی سوپەر و ژنێكی سوپەر لەئارادا نييە. ئەمانە ئەو چەمك و مەيلانەن كە ئايديۆلۆژييەتی فاشيزم پەرەی پێداوە و پێشی خستووە. لۆژيكێكی سێكسۆلۆژی پێشخراوە، ئەمەش دواترين داهێنانە كە گەلان لەنێو دەبات و قوتيان دەدات. نكوڵيكردنی ئەشق لەگەوهەری لۆژيكی سێكسۆلۆژيدا هەيە. ئەگەر سەدەی نۆزدەهەم سەدەی سەركەوتنی ئەشق بێ, ئەوا لەسەدەی بيستەم لەژێر ناوی پەيوەندی سێكسی رەها نكوڵی لەئەشق كرا. بێگومان ئەمە پێداويستييەكی ئيمپرياليزمە و لەهەمانكاتدا بۆ رژێمی 12ی ئەيلوليش پێداويستييەكی تەواو و سەرتاسەرييە. بەڵام گەلان هيچ پێويستييەكيان پێ نييە و بێ واتايە و مەترسيدارە. ئەم لۆژيكە بۆ ئەو كەسانە زۆر بەئاستەم و مەترسيدارە كە دەخوازن لەهەست و سۆز و ژيانی خۆياندا ئازادبن. پێويست دەكات هێز و تواناكاری ئەم لايەنە و ئەو تايبەتمەندييانەی سەرچاوەی خۆی لەرەگەزەوە وەردەگرێت بۆ تروپكی ئەنجامدانی سەركەوتن ئاراستە بكرێت.

لەلايەكی ترەوە سەرۆكايەتييە كۆمۆنيست و سۆسياليستەكان سەبارەت بەم مەسەلەيە كەم ـــ زۆر هەڵوەستەيان كردووە، بەڵام سنووردار بووە و ئەو هەڵوێستانەيان تێنەپەڕاندووە كە سەرچاوەی خۆی لەلۆژيكی پياو وەردەگرێت. بە تايبەتيش لەژيانی تايبەتی خۆياندا چەمكی باڵادەستی خێزانيان تێنەپەڕاندووە كە لەئارادايە. دەتوانين ئەمەش وەك كەموكورتيەكی رژێمە سۆسياليستەكان ببينين. ئەگەر بخوازين و سووربين لەسەر رێبازی سۆسياليزم، ئەوكاتە پێويست دەكات ئەو راستييە تێبگەين كە بێ

هێزكردن و تەپاندنی ژنان بەدرێژایی مێژووی شارستانییەت, رەوشێكی ئاسایی و سروشتی نییە و, دەبێ ئەم راستییە ببینین كە گرێدانی خۆی بەتەواوی پێشكەوتنەكانی كۆمەڵگا و پێشكەوتنی چینایەتییەوە هەیە و لەرۆژگاری ئەمڕۆشماندا بۆتە سەرچاوەیەكی مەزن و زەبەلاحی كێشە و گیروگرفتەكان. لەو باوەڕەدام هەرچەندە ئەم راستییانە شیبكەینەوە و چارەسەربكەین, ئەوا شۆڕش فراوانتر و قووڵتر دەبێتەوە و لەم چوارچێوەیەشدا ئەو نایەكسانی و بێدادییەی لەنێوان پیاوێتی پیاو و ژنێتی ژندا هەیە, لەئارادا نەمێنێ. قاڵبوونەوەیەكی چڕوپڕ سەبارەت بەم كێشەیە ئەنجام دەدەم تا دەگاتە ئەو پرسیارەی "پێویستە پیاو چ جۆرە پیاوێك بێت؟" پرسی " ژن پێویستە چ جۆرە ژنێك بێت؟ " كە بۆ من پرسیارێكی ژیانی و گرنگە، چونكە مێژوو وەكو پێویستییەك ئەم پرسیارە بەسەرماندا دەسەپێنێ.

### ب ـ ژن لەكۆمەڵگای كوردستاندا

میزۆپۆتامیا، ئەو شوێنەیە كە دەكەوێتە لێوارەكانی چیای زاگرۆس و لەتەواوی پەرتووكە پیرۆزەكان بەوڵاتی بەهەشت باسی لێوەدەكرێت و ئەو جێگایەیە كە نوح لەدوای تۆفان و گەردەلولەكە سەرلەنوێ لێی گیرسایەوە و تێیدا ژیا. هەروەها گەلان و خەڵكانی سەر ئەم خاكە بە ئومێدی ئازادیەوە ژیاون. ئەم ئومێد و گرێدان بەئازادییەش لەهی هیچ وڵاتێكیتر ناچێت. بەڵكو لەهیچ یەكێك لەو نووسینانەش ناچێ كە لەپەرتووكەكاندا نووسراون، یان تائێستاش وەكو پەرتووك نەنوسراون. بەڵام شەرێكی ئازادی لەئارادایە. پێدەچێ ئەمەش بۆ ئەوە بگەڕێتەوە كە پەرتووكەكەی بە تەواوی نەنوسراوە و رزگاری بە تەواوی بەدی نەهێنراوە. شتێكی وا سانایی نییە، بەڵكو زۆر ئاستەمە ئەو مرۆڤەی كە لەنێو لانكەی مرۆڤایەتیدا بوو, رەوشێكی دەرەوەی ژیان پەسند بكات كە زۆر خراپتر بێت لەگۆڕستان. ئایا بۆ جاری یەكەم مرۆڤایەتی لێرەدا گوزارشتی لێنەكرا و یەكەمین یاساش لێرە دانەنرا؟ ئایا لێرەدا لەژێر ناوی مرۆڤ گوزارشت لەئومێد نەكرا؟ ئەی هەر ئەم خاكە نەبوو كە لەهەر شوێن و جێگایەكیەوە ئاسەواری لێبەدی دەكرا؟ یەكەمین ئاژەڵ لێرەدا ماڵی كران. بۆ یەكەمین جار دانەوێڵە لێرەدا چاندرا و عەمبارەكانی لێ پڕكرا. یەكەمین گوند و شارەكانیش هەر لێرە ئاواكران. یەكەمین جار لێرەدا دەوڵەت سەری هەڵدا، هەڵبەست و مۆسیقاش لێرەدا داهێنران. یەكەمین هەست و سۆزی تەواوی مرۆڤایەتی ئالێرەدا لەدایك بوو. ئەگەرچی لەهەندێ شوێندا راستینەی چینایەتی دەركەوتن, وەلێ یەكەمین ئیمپراتۆرییەتی كۆیلایەتی لێرەدا بوو. یاسایەكی خێڵەكی دەركەوت و تا ئێستاكەش بە شێوەیەكی بەهێز بەردەوامە. بەڵام شتێكیتریش روویدا:

هەروەكو بڵێی تەواوی ئەمانە روویان نەداوە و بووە گۆڕەپانی داتاشراوی و سووان. ئێستا مرۆڤایەتی بێناسنامەیە و ئومێدیش نەماوە. چۆن ئەم ناكۆكییە مەزن دەبێ؟ هەم سەرچاوەی تەواوی پرەنسیپەكانە و هەم ئێستاكە هیچ شوێن پەنجە و شوێنەوارێكی نەماوە. پێویستە ئەم ناكۆكییە مەزنە چارەسەر بكرێت.

داستانی مەزنی گلگامێش لێرەدا بووە، واتە یەكەمین شوێنە كە هەڤاڵێتی تێدا پێكهاتووە، ئێستاكەش بۆتە شوێنێك كە خیانەتی تێدا بەڕێوە دەچێ. پێویستە ئەم راستینەیە شیبكرێتەوە و چارەسەر بكرێت. هەر بۆیە PKK رووداوێكی مەزنی چارەسەرییە. ئەو مێژووە جوان و مەزنە چۆن تێكشكا؟ ئەگەر بكرێ، مێژووی

سەرلەنوێ ژیانەوە چۆن دەبێ؟ بەڵێ جۆش و خرۆش لێرەدا سەرچاوە دەگرێ. گەنجینەکەمان لەو شوێنانە دەدۆزینەوە کە لێی وون بووە. لەو شوێنە لەمرۆڤایەتی دەکۆڵرێتەوە کە تێیدا لەدایك بووە و رەگ و ریشەکەی لێیەو هەر لەوێشدا دەدۆزرێتەوە, لەئەمریکا و روسیا وسیبیریا نادۆزرێتەوە, چونکە مەڵبەندەکەی ئێرەیە.

بەڵێ 25 ساڵەPKK بەدوای مرۆڤدا دەگەڕێ, ئەو مرۆڤەش مرۆڤی سەرەتایە بەڵکو راستریشە بڵێین مرۆڤی هەرە دواییشە, دەبێ بەم شێوەیە بێ, ئەگەر سڵاو لەژیان بکات و وەکو نەورۆز هەموو شتێکی لەڕێگای ژیانەوە, هێزی بێتەوە بەر, پێویست دەکات زمان و شێوازی ئەو بەدەست بێنین. هەربۆیە ژیان واسانایی نییە.

باش دەزانین و تێدەگەین کە میزۆپۆتامیا وڵاتی باب و باپیرانی عەشتارە. ماڵیکردنی ئاژەڵ لەلایەن کۆمەڵگای مرۆڤایەتی و ئەنجامدان و چاندنی دانەوێڵە یەکەمجار لەم ناوچەیە بەدەست ژنان ئەنجامدراوە, هەربۆیە دەکرێتە خوداوەند و دەگاتە گوزراشتی خوداوەندی ژن. تەواوی زانست و لێکۆڵینەوەکانی ئەرکۆلۆژی ئەم ڕاستیەیان سەلماندووە و پشت راستیان کردووە. بەڵام بەداخەوە لەرۆژگاری ئەمڕۆماندا ئەوانەی لەدوای عەشتارەوە بەجێ ماون دواکەوتووترین و بێچارەترین ژنانی جیهانن و, خێزان و کۆمەڵ لەسەر ئەم ژنانە پێکهاتووە. ئەگەر لەهەر شوێنێك ئازادی ئاستێکی هەبێت, ئەوا لێرەدا ئەمەش لەئارادا نییە. هەربۆیە ئەو شوێنەی خوداوەندی ژنی لێ لەدایك بوو, خاپوور کراوە و بۆتە کەلاوە. ئیتر وای لێهاتووە شوێنەوار و جێ پەنجەی ژیان نەمێنێ. ئێمە دەخوازین لەرێگای شۆڕشی میزۆپۆتامیا سەرلەنوێ گیانی بەبەردا بێنینەوە.

ئەو شوێنانەی کە بەشێوەیەکی گشتی بەلانکەی مرۆڤایەتی ناوزەد دەکرێ, ئێستا بۆتە گۆڕستانی مرۆڤایەتی. ئەوەی ئێمە ئەنجامی دەدەین لێکترازاندنی ئەم گۆڕە و دەرخستنی گیان لەبەرێکە. تایبەتمەندییەکی جوڵانەوەکەشمان ئەوەیە کە چیمەنتۆی ئەستووری گۆڕەکە دەتەقێنێ و بەرخۆدان و ژیانەوەیەك لەنێو ئەم گۆڕە دێنێتە کایەوە. دەتوانین PKK وەك گوزارشتێکی سەرلەنوێ ژیانەوەی تەواوی مرۆڤایەتی لە میزۆپۆتامیادا هەڵسەنگێنین. هەربۆیە بەر لەهەرکەس عەشتارەکان, زەنۆبیاکان و هەتا کیلۆپاتراکان و سەمیر ئەمیسەکان لەنێو ئەم گۆڕەدان. ژنانی بەهێز لەمێژووی مرۆڤایەتیدا هەن. مریەمەکان و فاتمە و زەینەب و عائیشەکان هەن. لەمێژووی خۆشماندا ژنانی لەمجۆرە هەن.

ئێمە لەنێو هەوڵدانێکداین گۆڕەکانی ئەم ژنانە هەڵدەدەینەوە و, دەڵێم ئایا جارێکی تر سەرلەنوێ ژیانیان دێتەوە بەر یاخود نا؟ ئومێد نابڕێت و کۆتایی پێنایەت!

خاك و زەوی و زاری میزۆپۆتامیا بەپیت و بەرەکەتە. بەگوێرەی ئەمەش تاکو ئێستا خاك و ئاو و خۆر بەشێوازێك ئاوێتەی یەکتر بوون, کە زۆرترین بەرهەم بەدەست دێنێ, ئەمەش مەزنترین راستینە دەخوڵقێنێ. بەروبوومەکان بەتامترین و سەرنج راکێشترین بەروبوومن. مرۆڤەکانی دەتوانن ببنە خاوەنی خۆشترین و جوانترین ژیان. مادده (کەرەستە) کانی کەمێك هەل و تواناکاری ئەمە دەرەخسێنێ و رێی پێدەدات.

ئەمرۆکەش ساختەکارەکان بەناوی خوداوەندەکان و لەجیاتی ئەوان هاونەتەوە و خاوەن بیروباوەڕەکانیش هەموویان لەئارادان و ژنانیش بەردەوام بوونەتە بەڵای ژیان.

هەروەکو چۆن شوێنەوار و پاشماوەی خوداوەندی ژن نەماوە و ئیتر خوداوەندە پیاوەکانیش دووچاری لەبیرچوون هاتوون. هەوڵدەدەین تەواوی ئەمانە شیبکەینەوە و چارەسەری بکەین.

هەروەکو چۆن لەگلگامێشدا دەستی پێکردووە, پێویست دەکات لێکۆڵینەوەکانی ژیان و گەڕان بەدوای نەمری, بەشێوەیەکی دروست و راستگۆیی بێت, بەجۆرێك لەگەڵ راستینەی ئەوان شیاو و گونجاوبێ و لەگەڵ بنچینەی مێژوویی ئەم شوێنەی کە لانکەی مرۆڤایەتییە و پێویستە جوانترین ژیان بێ. هەرئەمەش شایان و شیاوی ئازادی مرۆڤایەتییە. " کاتێ دەڵێین 25 ساڵە تەواوی نەورۆزەکان بۆ PKK ساڵانی لێگەڕین و بەیەك گەیشتنە " مەبەستمان ئەم راستینەیەیە.

ژن و ژیان لەزمانی ئێمەدا بەهەمان وشە ناوزەد و گوزارشتی لێ دەکرێن. راستینەی نەتەوایەتیمان بەیەکەوە لەگەڵ راستینەی ژن و ژیان هەڵدەسەنگێنرێ و شیدەکرێتەوە. بەڵام هەروەکو دەبینین, ئەگەر لەرۆژگاری ئەمرۆماندا دوو وشەی زۆر لەیەکتر دابڕاو هەبێ هەر ئەمانەن, بەداخەوە لەئەنجامی دەست درێژی و داگیرکاری سەدان ساڵە کۆمەڵگا کەوتۆتە نێو رەوشێکی داڕووخاوی و ژنی راکێشاوەتە نێو رەوشێك کە ژیان لەبیر بکات و, ژیانیشی گۆڕیوە و کردوویەتی بەدۆزەخ. ئەو کەسایەتییە شکۆمەندەی ژن کە لەسەرەتای مێژوودا هەیبوو و, کۆمەڵگا و بەرهەمهێنان وماڵداریکردنی ئاژەڵی کردبووە هونەرێك و ئەو کولتوورەی کە ژنی وەك یەکەمین و سەرەتاترین خوداوەند دەرخستە مەیدان, وەلێ لەرۆژگاری ئەمرۆماندا بەتەواوەتی گۆڕاوە و بۆتە دەردەسەری, پێش هەرشتێك پێویستە ئەمە بزانرێت. ئەگەر ژیان ببێ و پەیرەوی لێبکرێ, ئەوا لەگەڵ ژندا دەبێ و تەنیا لەئەنجامی چەکەرەکردن و سەرهەڵدانی جوڵانەوەی ئازادی ژنان بەدی دێت. ئەمەی کە دەیڵێم وەك رستەیەکی ئاسایی بەکاری ناهێنم. لەرەوشێکی پێچەوانەی ئەمە ژیان نابێ و ناشێ, لەرەوشێکی پێچەوانەی ئەمە نابین بەمرۆڤ.

بێگومان لەراستینەی کوردستاندا خێزانی وا دەبینین کە لەئاستی تیرەدایە و, خێڵایەتی بەشێوەیەکی بەرفراوان باوە, ئاستی نەتەوەییش زۆر پاشکەوتووە. ئەمەش ئەوە بەدیاردەخات کە پەیوەندییەکان زۆر دواکەوتوون. ئەگەر ئەو پەیوەندییانەی لەئارادان لەچوارچێوەی سنووری خێزاندا بمێنێتەوە و لەدەوروبەری پەیوەندی ژن ـــ پیاو پێش بکەوێت ئەوا مەترسییەکی زۆری دەبێت. ئەو پەیوەندییە پاشڤەرۆییەی لەئارادایە, پەیوەندی خێزان بەمجۆرە لەسەر پێیان رادەگرێ. راکێشان بەرەو ئاستی پەیوەندی نەتەوەیی و پەیڕەوکردنی سیاسەت لەم پێناوەدا و ئاواکردنی سوپای سەربازی و شەڕکردن, لەلایەنی خێزانەوە نابینرێ. لەجیاتی ئەوە پەیوەندی سنووردار و تەنگ لەئارادایە و پەیرەوی لێدەکرێت. هەتا بگرە ئەمەش لەجێگای خۆیدا نابینرێ و دەڵێت: " هەمووشت بۆ خێزان ". هەربۆیە ئەو موحافەزەکاری و پاشکەوتنەی کە لەئاستی سەردەمدا هەیە و لەمانەش گرنگتر راستینەی خێزانمان, شێوازێکی بێ هێزی پەیوەندییەکانە. پەیوەندی نەتەوایەتی بەشێوەیەکی زۆر خراپەکارانە لەلایەنی پەیوەندی داگیرکەرانەوە بەکار دەهێنرێ, هەربۆیە رەوش بەم شێوەیەیە. ئەگەر بەشێوەیەکی قووڵتر داکەوینە ژێر, دەبینین کە پەیوەندییەکانی خێزان بەشێوەیەکی

زۆر رەها, شێوازێکی سەرەتایی و سروشتییە کە لەپاشماوەی قۆناخە سەرەتاییەکانی کۆمەڵگادا ماوەتەوە, واتە پەیوەندی ژن ـــ پیاو لەسەر بنەمای تێرکردنی ئارەزووە سێکسییەکانە, ئەمەش بەشێوەیەکی زۆر ئاشکرا پەیڕەو دەکرێ. بەمجۆرەش راستینەی ئێمە لەوەدایە کە لەنێو ئەم قۆناخەدا نەژیاوین کە کۆمەڵگاکان پێشکەوتنێکی مەزنیان بەدەست هێناوە, بەتایبەتیش لەلایەنی سیاسی و سەربازی, قۆناخەکانی پێشکەوتنمان بەخۆمانەوە نەبینیوە و بەتەواوی لەلایەنی دوژمنانەوە ئابلۆقەدراوین و هەستمان بەوە کرد کەوتووینە رەوشێکی نەزۆکی و سنووردارەوە. بەڵێ لەراستیدا پەیوەندییە پاشکەوتووەکانی خێزان, بەواتایەکی تر ئەو پەیوەندییەی کە لەسەر بنەمای برسێتی رەها و تێرکردنی ئارەزووە سێکسییەکانە, راستینەی ئێمە پێکدەهێنێ. بێگومان ئەمەش راستینەیەکە کە بەشێوەیەکی زۆرخراپ شێوێنراوە و چەواشە کراوە. نەتەوەیی بوون لەڕاستینەی نەتەوەیی داگیرکەران نەشونمای کردووە. راستینەی نەتەوەیی بەمجۆرەیە, هەتا کاتێك پێکهاتەی خێڵایەتی پەرتەوازەش دەبێ, کوردایەتی لاوازتر و کەمتر دەبێ. لەهەندێ شوێندا مانەوە وەك خێڵێکی بەهێز بەواتای ئەوەدێت کە وەکو کوردێك ماوەتەوە, واتا تاڕادەیەك کوردێتی لەنێو خێڵەکاندا ماوەتەوە و بەردەوامیشە. بێگومان لەدەرئەنجامی ئەو پەیوەندییە بەکرێگیراوییەی کە سەرۆك خێڵ لەگەڵ داگیرکەران پەرەی پێدەدات, بەمجۆرەش خێڵەکەی دەخاتە ژێر خزمەتی دوژمنەوە. لەجیاتی بەنەتەوەیی بوون, بەشێوەیەکی رۆژانە خێڵ پەرتەوازە دەبێت و بڵاوەی پێدەکرێت و لەدواییشدا تەنیا خێزان دەمێنێتەوە. خێزانیش هیچ پەیوەندییەکی بەنەتەوایەتی و نەتەوەیی بوونەوە نییە. لێرەشدا لەئاستێکی مەزن و مەترسیدار هەڵسوکەوتی بە مەسەلەی نەتەوایەتی دەکرێ و دەسوێ و پەیوەندی هەرزان و ئارەزومەندێتی (غەریزە) کۆمەڵگا پێشدەکەوێت و, راستینەی ژیانێکی وا دێتە ئاراوە کە پاشماوەی کۆمەڵگای کۆمۆنەی سەرەتاییە و لەسەر بنەمای تێرکردنی ئارەزووەکانە, ئەمەش ئەو راستینەیەیە کە لەکوردستاندا لەئارادایە و پەیڕەو دەکرێت.

ئەگەر " مەم و زین " بخوێنین, لەوێدا وەسفێکی زۆر باشی سروشت دەبینین. ئەحمەدی خانی بەشێوەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەر سروشتی هەرێمی " بۆتان " وەسف دەکات و دوایش هەوڵدەدات جوانییەکەی بگرێتە دەست و هێزەکەی شیبکاتەوە و هەڵیسەنگێنێ، وەك شیمانەیەکی مەزن هەوڵ دەدات نەتەوەیی بوون بەدەست بێنێ و پێیبگات، لەوێشدا سکاڵا لەباڵادەستی عەرەب و عەجەم و تورکان دەکات و، لاوازی و بێهێزی کوردان جێی باسە, توانیم ئەو دەرئەنجامەی لێدەربخەم کە ئەشقی " مەم و زین" گوزارشت لەوە دەکات, گرێبەندێکی ئاغایەتی لەبەردەم قۆناخی دیموکراسیبوونی نەتەوەیی هەیە. ئەگەر بێتو لێکۆڵینەوە و لێتۆژینەوە سەبارەت بەم شێوازانە بکرێت دەبینرێ کە دەخوازێ بەدیهێنانی پێشکەوتنی نەتەوەیی و تا رادەیەکیش دیموکراسی بەدی بهێنرێ. هەروەها لەبەرئەوەی کاریگەرییەکی زۆری لەنێو دابونەریتەکانی ئێمەدا هەیە, هەروەکو لەمێژووی زۆربەی نەتەوە و گەلان بەمجۆرەیە. بۆیە لەرێگای چیرۆکێکی ئەشق و دڵداری مەبەستەکانی خۆی دێنێتە زمان و خەڵك ناچاری بیستنی دەکات. پێویست دەکات کە کچە ئاغایەك و کوڕە ئاغایەك زۆر بە ئاسانی لەگەڵ یەکدا پەیوەندی ببەستن، چونکە لەرێی ئەم پەیوەندی و یەکتر خواستنە، یەکتری بەهێز دەکەن و هێز دەبەخشنە یەکتری، چەرخی ناوین پڕە

لەنموونەی بـەمجۆرە. بێگومـان چینی دەرەبەگایـەتیش تاڕادەیـەك لەسـەر ئـەم بنەمایـە پێکهـاتووە، بـەڵام پێشکەوتن لە "مەم و زین" دا بەمجۆرە نەبووە. ئەم شاکارە لەکۆتاییەکانی سـەدەی شـازدەهەم نووسـراوە. ئەگەر کۆتاییەکانی ئەم سەدەیە بێنینە بەرچاو و بیربکەینەوە، یەکسەر دەبینین کە داخـوازی و ئومێـدەکانی یەکێتی نەتەوەیی پێشکەوتووە و سەنگین بووە، بەڵام قۆناخێك بووە کە ئاغایـەتی سـەختترین کەندوکۆسـپ بووە لەبەردەم ئەم ئومێد و داخوازییە. لێرەدا موحافەزەکاری فیودالّی و پارچەگەرێتی و دوژمنایەتی ئاغاکان بەشێوەیەکی ئەوەندە بێ رەحم و بێ بەزەییانـە پـەیڕەوی لێـدەکرێت، کـە بەهـەق شـایانی ئەوەیـە کـە پـێ بگوترێ "داستان ". بـاش دەزانم و تێدەگـەم کـە ئـەم ئەشـق و دڵدارییـە سـەرنەکەوتووە. جگـە لـەوە لـەو داستانەدا ئەحمەدی خانی دەخوازێ بەشێوەیەکی پیرۆز و شـکۆمەندانە بـاس لـەجۆش و خرۆشـی هەسـت و سۆزەکان بکات. بەڵام هەروەکو دەزانین لەکۆتاییشدا وەك هۆکاری سەرنەکەوتن باس لەخیانـەتیش دەکـات. ئیتر لەدەرئەنجامی فیتنە و فەسادی و گێرەشێوینی و تێکدانی " بەکۆ " وە بگرە تـا دەگاتـە بـێ رەحمـی و دڵ ڕەقی ئەو بەگەی چاوەکانی کوێربووە, ئەنجام سووتانە! بەڵێ کڵپە بەکڵپە دەیسووتێنێ، خۆشـی کـوڕی بەگێکی مەزن و زەبەلاحە. بەڵام لەوێـدا لـەئاکامی بێچارەیی دووچـاری نەخۆشـی سـیل دەبێـت و بـەمجۆرە دەڕوات و لەناو دەچێ. ئەگەر باش بیرتـان کردبێتـەوە و تەماشـاتان کردبـێ ئـەوا دەبیـنن زینـیش ئەوەنـدە پەرێشانە ناتوانێ قسەبکات و زمانیشی ناگەڕێ. لەراستیدا بە هەمووی دوو قسەی کردووە یـان نـا ! ئەمـەش یاسایەکی کوردانە، واتە بەمجۆرە نابێ قسە بکات. بیر بکەنەوە, سـەیر بکـەن 300 سـاڵ پـێش ئێسـتاکەش تایبەتمەندییەتی کوردان هـەر بـەو شـێوەیە زینـدوو بـووە. ئەگەرچـی خیانـەت و بـەکرێگیراوی وەکـو ئـەمڕۆ پێشکەوتوو و لەپێش نییە, بەڵام سەرەڕای ئەمەش لەئەنجامی ئـەو هۆکارانـەی باسمـان کـرد, ئەشـق گەشـە ناکات و سەرکەوتن بەدەست ناهێنێ. تەنانەت لەنێو ئەو زەمینـە ئاغایەتییـەی کـە پێـی رازی نـین و لـەجێی خۆیدا نابینین، دیسان پیرۆزی هەست و نەست لەئارادایە، لەمانایەکدا پیرۆزی خـۆی هەیـە. ئـەو گوزارشـت و ئاخافتنەی ئەحمەدی خانی بەر لە 300 ساڵ گوتوویەتی ، تا ئێستاش گرنگی خۆی بۆ من هەیە. کـاتێ ئـەم پەرتووکە دەنووسێ دەڵێ:" من بۆیە ئەم پەرتووکە دەنووسم تاوەکو ئەوە روون بکەمـەوە و بیسـەلمێنم کـە کوردان بێ ئەشق نـین، بـەڵکو ئەشـق و قارەمـانێتی و زانستیشـییان هەیـە". بێگومـان ئەمـە گوتەیـەکی زۆر گرنگە. ئەگەر بەهۆشیاری تەماشـای بکـەین دەبیـنین کـە لەوکاتـەدا بـاس لەپێویسـتی ئەشـق و قارەمـانێتی دەکات. ئەو بەهایانەی بەر لە 300 ساڵ لەنێو کورداندا هەبوون, وون بوون و نەمان. لەراستیدا لـە "مـەم و زین"دا ئەشق بەدی نەهاتووە, ئەمە راستینەیەکە پێویسـتە بەرکـەنار نـەکرێ، هێـز و توانـای ئـەوەیان نییـە لەرێگای خۆشەویستییەوە بژین، ئـەم هێـزەش نـە لـەپیاودا هەیـە و نـە لـەژنیش. ئـەوەی بەرلـە 300 سـاڵ هەبوو, ئەویش لەدەست چوو. ئەوەی وەك پاشماوە ماوەتەوە شێوازێکی ژیانی مێروولەیە، شێوازێکی ژیـانی گرگنییە، من بەوانە ناڵێم ژیان و بەمجۆرە ناوزەدیان ناکەم.

باسی لاوك و داستانی دەروێشـی عەبـدیم بـۆ کـردن، لێـرەدا داسـتانێکی تراژیـدی لەئارادایە. باسـی ئـەم تراژیدیایە بەم شێوەیەیە کە: داستان و لاوکێکی 200 ساڵ بەر لەئێستایە، بەڵام لەوێدا یاسایەك هەیە، لەنێو کەسـایەتی و تراژیـدیای کـورددا پیـاو هەرچـەندە عاشـق بێـت و لـەنێو زەمینـە و بـەها و دابونەریتـەکانی

دەرەبەگایەتیدا بێت، دوو دوژمنی داگیرکەری هەیە، پیاوەکە بەشێوەیەکی قارەمانانە تا دوایی دەجەنگێ و لەکۆتاییشدا لاشەکەی لەنێو دەستی کچەکەدا دەمێنێتەوە. ئەم کچەش لەوێدا ئەم دونیایە پەسند ناکات و وەك گۆڕێکی دەبینێ. واتە لێرەدا بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا فەلسەفە و رەوشتێکی زۆر مەزن لەئارادایە. ئەمەش رەوشتی ئەشق و شەڕی ئێمەیە.

ئەمە داستانی تراژیدیای نەتەوەییمانە

واتە کچە کوردێك 200 ـ 300 ساڵ بەر لەئێستا خاوەنی ئەشقێکی چەندە مەزنیش بووبێت، رێگای ئەمەی لەشەڕی بەرامبەر بەدوژمندا بینیوە, سەرەڕای ئەوەی خاوەنی پەیمانی مەزنە و هێزی ئیرادە و جوانی هەیە، دیسان ئەشق بەشەڕەوە گرێدەدات و بەمجۆرە دەیگرێتە دەست و ئاماژە بەوە دەکات کە لەشەڕدا دوای لەنێوچوونی ژیان نامێنێ, بەڵکو ژیان تەنیا لەنێو شەڕ و لەنێو چیاکاندا هەیە و دەشێ بەردەوام بێ. ئەمەش فەلسەفەیەکە. کچ لێرەدا چ دەڵێ؟ دەڵێ:" نەدەخۆم و نە دەخۆمەوە و نە دەگەڕێم و نە تەماشای هیچ کەسێکیش دەکەم، شەڕ دەکەم و لەسەر لوتکەی ئەم چیایانە دەمرم ". هەروەها لەوێدا مرۆڤی ئازاد و مەرد هەیە. جگە لەئەنجامدانی شەڕێکی گەردەلوول ئاسا بەرامبەر بەدوژمن, بیر لەهیچ شتێکی تر ناکاتەوە. ئەمەش ئازایەتی مێژووییمانە و تاکە راستینەیەکە پەسندی بکەین, ناموس چییە؟ ئەم لاوکە بەسە بۆ ئەوەی ئەم مەسەلانە روون بکاتەوە.

واتە لەخۆڕا من مەسەلەی دەروێشی عەبدیم وەك نموونەیەك نەهێنایەوە و نیشانم نەدا. هۆکاری نیشاندانی ئەم نموونەیە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە تاکەکەس چەندە بەئومێد بێ، ئەم ئومێدەی لەچوارچێوەی ئەشقیشدا بێ، ئەوا هێندەی ئەوە پاڵ بەمرۆڤەوە دەنێ کە شەڕێکی مەزن بەرامبەر بەدوژمنەکەی ئەنجام بدات، هەڵوێستی عەدول چییە؟ ئاشکرایە ، شتێکی لەلاوك روون و ئاشکراتر بێ هەیە. تف لەرووی ئەم پیاوە دەکرێ کە سەرکەوتن بەدەست ناهێنێ! کاتێ هەوڵمدا رووداوی "مەم و زین" و "دەروێشی عەبدی" شیبکەمەوە و هەڵسەنگێنم، خواستم سەبارەت بەڕەوشی ژیان, هەندێ راستیتان بەبیر بێنمەوە. لێرەدا راستینەیەك جێگای باسە، راستینەی گەلێکی تالانکراو و، راستینەی ژیانێکی لەدەست دراو و ژنێکی وون بوو، لەمەش خراپتر راستینەی پیاوێکی تێکشکاو, جێگای باسە.

لەراستیدا کورد نوێنەرایەتی گەلێك دەکات کە لەخۆشەویستی بێبەشکراوە! لەئاستێکی وادا دووچاری کوشتار و لەناوبردنی خۆشەویستی هاتووە کە باوەڕ ناکرێت. لەکوێ کۆتایی بە دڵ و خواستەکی کوردان هاتووە؟ چ کاتێك کۆتایی پێهاتووە؟ ئەم دڵ و داخوازییەی لەکورددا هەیە هی کێیە؟ هەست و نەستەکەی هی کێیە؟ ئەگەر گیانێکی هەبێت ئەم گیانە هی کامە بیانییە؟ ئەمە چ بێچارەیی و بێ ویژدانیەکە؟ بۆ نموونە چۆلەکە بوونەوەرێکی سروشتییە و کاتێ دەستێکی بیانی بەرکەوێ دەفڕێ و رادەکات، چونکە مەترسی دەبینێ و دەڵێ:" دەستێکی حەرام بەر هێلانەکەم کەوت ". ئێمە بەدرێژایی سەدان ساڵە تەنیا یەك شوێن لەخاکیشمان نەما لەلایەنی راستینەی دوژمنەوە داگیرنەکرێت. گەر ئێستا راستی بڵێم، دەڵێن: ئەی ئێمە ژیان نەکەین؟ با بژین, بەڵام لەهەمانکاتدا ئەم راستینەیە ببینین و چارەسەری بکەین. ئەگەر چارەسەری نەکەین

دەبین بەچی؟ دەبینین کورد لەسەر خاکی خۆی نامێنی و هەرکەس رادەکات و دەگری! ئەوەتـە کوردسـتان بە تەواوەتی چـۆڵ کـرا، ئـیتر وای لێهـات تـەنیا کەسـێکیش لەکوردسـتاندا نـەما کـە بڵـێ:" مـن کـوردم، مـن دەخوازم ئازادانە بژیم، من بە شەرەفم ".

خۆشەویستییەکی کوێرانە, دابڕان لـەهزر دێنێتـە ئـاراوە و دەرگـا لەبـەردەم هـەموو جـۆرە کۆیلایەتییـەك ئاوەڵا دەکاتەوە.

هەروەکو گوتم تەماشای هێلانەی چۆلەکە بکەن، کاتێ دەستی مرۆڤ بـەر هێلانەکـەی یـان بـەر هێلکـەکانی بکەوێت, ئەوا چۆلەکەکە ئەوێ چۆڵ دەکات و بەجێی دێڵێ و ئیتر ناڵێ ئـەوێ هێلانەمـە و هێلکـەکانمی لێیـە. بەڵام وەرن تەماشا بکەن تەنیا یەك شوێنی هێلانەکەمان, واتە وڵاتمـان و ماڵـەکانمان نـەماوە کـە نـەك تـەنیا دەستی دوژمنی پێنەگەیشتبێ، بەڵکو هەر شوێنێکی لەژێر پۆستاڵەکانیدا پان کردۆتـەوە و جێگایـەك نـەماوە پێی نەگەیشتبێ. ئەمەش شتێکی ئاشکرایە، جەندرمەیەك، پۆلیسـێك هـەروەکو دڵـی دەخـوازێ دەچـێتە نـاو هەموو ماڵێك و وەکو دەخوازێ دەستدرێژی بۆ پیـاو و کـچ و ژنەکـەی دەکـات. هـەموجۆرە بـێ رێـزی و بـێ ئابڕوویی‌ەك دەکات. ئەمەش راستییەکی روون و ئاشکرایە. لەرەوشێکی بەمجۆرەدا پیاوێتی پیاوەکانمان چەند فلس دەکات؟ ژنێتی ژنان چەند فلس دێنێ؟ بەڵێ بە هەڵوێستێکی سووربوون و بەبڕیار, کەسایەتی کـورد بـۆ گفتوگۆ دەکەینەوە. لەبناخەدا ئەو خاڵـەی کۆتـایی بـە کەسـایەتی کـورد هێنـاوە, مەسـەلەی رەگەزییـە. بـە تایبەتیش خێزانگەری لەسەر بنەمای رەگەز و لەسەر بنەمای باڵادەستییە بەسـەر ژنـدا, هـەروەها هەڵوێسـت بەرامبەر منداڵەکانیش بە هەمان شێوەیە. هەروەها شێوازی لەپێشتری ئەمـە خێڵایـەتی و هۆزایەتییـە. شـتی هـەرە گـرنگیش پەسـندکردن و هەرسـکردنی ئەمانـە وەك کولتوورێـك و کەسـایەتییەك، خـۆی لەخۆیـدا بـێ کەسایەتییە. ئەگەر کەسایەتی ئەم رەوشە بەلاوە نەنێت و تێپەڕی نەکات, هیچ کاتێك نابێتە سیاسی و نابێت بەجەنگاوەر. هەربۆیە خێزان دەزگایەکە مسۆگەر پێویست دەکات لەنێو کۆمەڵگای کوردستاندا چاوێکی پێدا بخشێندرێ و هەڵوەسـتەی لەسـەر بکـرێ. بـە گـوێرەی مـن "خێـزان " بیرێکـی بـێ بنـە و بەشـێوەیەکی زۆر مەترسیدار بۆ خستنی ژن و پیاو ئامادە کراوە. نازانن تا چ رادەیەك کەوتوونەتە نێو قووڵایی و تاریکی و تا چ رادەیەك داڕووخان؟!

ئەم کچە خوێن گەرمانە هەرکە دەگەنە تەمەنی هەژدە سـاڵی دەکەونـە نێـو خۆشەویسـتییەکی کوێرانـەی ترسناك و ناچارن بکەونە نێوی! بەڵام ئەمە داڕووخانە. بێگومان چەمکێکی خۆشەویستی کوێرانەی بەمجۆرە بە مانای بەرکەوتنی دووەمین لێدان و کودەتای مەزن دێت. خۆشەویستییەکی کوێرانە خۆی لەخۆیدا دابـڕان لەهزر و بـیر دێنێتـە ئـاراوە و دەرگـا لەبـەردەم هـەموو جـۆرە کۆیلایەتییـەك ئـاوەڵا دەکـات و بـە پێویسـتی دەبینـێ. ئەمـەش بـەمانای کـەوتنێکی مـەزنی هەسـت و سـۆز و کـەوتنێکی مـەزنی هـزری دێـت و بـەمانای لەهێزکەوتن و لەپەل‌و پۆکەوتن دێ. بێگومان لەدوای جووت بوون کێشەی ئابووری و ئەو کەوتنـەی لەئاسـتی ژیاندا دێتە ئاراوە, ئەنجامێکی وا لەگەڵ خۆیان دێنن کە هیچ بەدوای کولتـوور و هونـەردا نەگـەڕێن و بـەدوای ئاستێکی باشی ژیان و جەستەیەکی باشدا نەگـەڕێن، ئەمـەش رەوشـێکی زۆر خـراپ و مەترسـیدارە. کچـێکی خـوێن گـەرم کـە دەگاتـە تەمـەنی بیسـت سـاڵان جێگـا و رەوشـی بەرهەمهێنـەری خـۆی لـەنێو کۆمـەڵگا

لەدەستدەدات و کۆتایی پێهاتووە. لەڕاستینەی کۆمـەڵگای ئێمەشـدا ئـەوە گرنگـە"" ئایا درێـژە بـە نـەوە و ڕەچەڵەکی خۆی دەدات یان نا ". لەئاستی نەتەوەییدا کۆتایی بـە ڕەچـەڵەك هـاتووە! لەئاسـتی وڵاتـدا, بـێ وڵاتی و بێ بەشبوون لەوڵات لەئارادایـە! لەئاسـتی ئـازادیش ڕەوشـێکی وەهـا لەئارادایـە کـە باسیشـی لێـوە ناکرێت! ئەم یەکێتییەی ڕاستینەی کۆمەڵگامان یەکێتیەکە پەرێشانمان دەکات, یەکێتیەکە کە هێز لەدەست دەدات, هێشتا کچە لەتەمەنی پانزدەساڵی دایە هەروەکو سەری بخاتە نێو کونە زەردەواڵە, سەری دەخاتـە نێو خێزانێك. پیاویش کەوتۆتە ڕەوشێکی وا سـەیر و سەرسـوڕهێنەر کـە تـەواوی پیـاوێتی و ناموسـی خـۆی لەباڵادەستی و زاڵبوون بەسەر ئەو ژنەدا دەبینێ. ئەمـەش لەبچـووکترین تەمەنـدا ئـەنجام دەدرێ، ئـیتر لـەم تەمەنـەدا نەچـاوەڕوانی بـیر و هـزر کـردن لـەوڵات و نەگـەڕان بـەدوای ژیـانێکی جـوان, لـەپیاو و ژن و منداڵەکانیشیان ناکرێ. تەواو بەپێچەوانەوە لەپێناو تێرکردنـی سـکی برسـی لەبـەردەم دەرگـای داگیرکـەران ڕۆژانە چل تەقلە لێدەدات. هۆکاری سەرەکی ئەو ڕەوشەی کە تەواوی جاش و بە کرێگیراوەکانی نێو کۆمەڵگا و خائینە ناقۆڵا و بەناو بانگەکانیش تێیدان، بـۆ ئـەم هۆکـارە دەگەڕێتـەوە. ئەنجامێکـە کـە چـەمکی ژیـانی خێزان هێناویەتە کایەوە. هەڵبەتە کاتێك هێشتا لەتەمەنێکی خراپ و ناتەندروستی لەپانزدە ساڵی بکەونە ناو پەیوەندی سێکس و پەیڕەوی لێبکەن, دووچاری شکست دێن. هـەر بۆیـە ئـەو خێزانانـەی ئـاواکراون چـاڵی ژێرکەوتن و شکستن، چاڵی کەوتن و لەنێو بردنن.

ناسنامەی پیاوی کورد لەڕاستیدا لەژن زیاتر بووە بـە کۆیلـە و, سـەبارەت بـە مەسـەلەی ژن و ڕاسـتینەی "ژن واتای ژیانە" ئاشکرایە کە زۆر بێئاگا و نەزانە.

بە تایبەتی ڕەوشی کەوتووی پیاو لەکوردستان منی بەرەو ئەو کێشـەیە ڕاکێشـاوە. بەشـێوەیەکی گشـتی سەبارەت بەگەلی کورد گوتم:" گەلێکە کراوە بەژن ". هەندێ کەس دەخوازن ئـەم گوتەیـەم لـەدژی ئێمـەش بەکار بێنن. مانای ئەمەش ئەوە بوو: هەروەکو بە درێژایی مێژوو دەستدرێژی و داگیرکاری بەسەر گەلەکەمان کۆتایی پێنەهاتووە و نەبڕاوەتەوە، گەلێکە کە بەردەوام گرێدراوی هەر داگیرکەر و زۆردار و دەسپۆتێك بووە, کە ئەمەش تارادەیەك لەپیاوی دەسەڵاتدار دەچێت. لەم لایەنەوە گوتم:" بە ژنی کۆیلەدەچێ " ئەمـەش واتـا بەخشە. کاتێ دەربازی پرسیارێك بووم گوتم: ئایا ڕۆڵی پیاوی کورد لەمەدا چییە؟ بینیم کە لەڕەوشـێکی زۆر بەئێش و ئازاردایە. هەروەها بینیم بەگوێرەی مانای کلاسیکی هێندە لەپیاوانی نەتەوەکانی تر ناچێ و لایەنی زۆر جیاوازی هەیە.

ئەو پیاوەی لەژێر کاریگەری و فەرمانڕەوایی سیستەمە داپلۆسێنەرەکاندایە تەواوی ئـێش و ئـازاری ئەمـە لـەژنان و منـداڵان دەردەخـەن. هـەروەها سـەیرە لەهەمانکاتیشـدا دەخـوازێ سەرچـاوەی هـەموو خۆشەویستییەکی لێرەدا ببینێ. واتە هەم لێیـدەدات و هـەم خۆشـی دەوێـت و هـەم فرمێسـکی بـۆ دەرێـژێ. کەسایەتییەکی زۆر ناکۆکە دەخـوازێ خۆشەویسـتی بکـات و دەیکـوژێ! کوشـتن لەشـێوازی خۆشەویسـتی و حەزکردنیدا هەیە. بۆ منداڵەکانیشی بەم شێوەیەیە. ئەم جۆرە پیاوەم زۆر بێچارە بینی. کاتێ بـە بێچـارەیی هاتە بەرچـاوم گرنگـی شـیکردنەوە و هەڵسـەنگاندنی ئـەم پیـاوە هێنـدەی شـیکردنەوە و هەڵسـەنگاندنی ژن پێویست بوو. کاتێ بە گوێرەی چەمکی کلاسیك دەڵێن ژن, بەردەوام دەڵێ:" لە 99٪ دەبێ سۆز و تێڕوانین

و ناموس، هەمووی هی من بێ ". ئەم فەلسەفەیەش زۆر مەترسیدارە. چونکە ژنێك کە لە 99٪ی هەر شتێکی هی تۆ بێ لەنێو کۆمەڵگادا بە کەڵکی چی دێت؟ سەبارەت بە وڵاتپارێزی چی دەکات؟ هیچ شتێك بۆ وڵاتپارێزی و ئازادی و ڕێکخستن, هەتا بۆ شەڕ و ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری هیچ شتێکت نەهێشتۆتەوە کە ئەنجام بدرێ. خستوتە نێو لەپی خۆت و وەك لیمۆیەك دەیگوشیت, یاخود وەك بەرداخێکی ویسکی بەردەوام لێی دەخۆیتەوە. هیچ شتێك لەئارادا نییە کە ئەمجۆرە پیاو و ژنە بەکۆمەڵگای ببەخشن.

لەڕاستیدا پیاوانی کورد لاوازترن، لەبەر ئەوەی ئەم پیاوانە لەلایەن دوژمنەوە ریسوا کراون، ئەو هێزەیان نییە خاوەن لەژنان دەربکەون. هەرچەندە بە مانای رەها وەکو پیاو دیار بن، لەراستیدا لەرێگای شێوازی تایبەتی سیستەمدا پێکهێنراون. پیاوێتییەکی وا جددی لەواندا جێگای باس نییە, هێزی ئەوەیان نییە دوو قسە بەرامبەر بە ژنان بکەن. بۆ نموونە هێرشێکی عەرەبان روویدا، یەکەم کاری کە ئەنجامیاندا ئەوە بوو کە پیاوانی کورد بخەنە نێو رەوشێکی بەمجۆرەوە، واتە ئەمە فەلسەفە و جینۆسایدێکە. هەندێکیان بەجەستەیی لەنێوبردن ـ ئێستاکەش بەم شێوەیە ــ ئەوانەی کەمانەوە دەیانکەنە چڵکاوخۆری خۆیان, چڵکاوخۆریش پیاویان لێ هەڵناکەوێ. ئاغا و دەربەگەکەشیان بەکرێگیراوە و مەقاشە. باشترین پیاویان بیرۆکراتێکی هیچ و پووچە. هەر شتێك بە پێنج فلس دەفرۆشێ. دیسان دەیلێمەوە پیاوانی کورد ریسوا کراون. ئەمە شێوازی عوسمانیەکانیش بوو. یەکەمین شێوازی ئەو بە ژن کردنە, فەرماندە تورکەکان بەشێوەیەکی زۆر جوان بەرامبەر بە سەربازە کوردەکان جێبەجێ و پەیڕەویان کردووە. لەڕاستیدا بەم شێوەیەیە.

بەداخەوە ئەوەی لەدەست پیاوانی ئێمە دێ ئەوەیە لەتەمەنی 13 ساڵی تا 25 ساڵی ئاوایی بە ئاوایی دەگەڕێ و دەسوڕێ تا وەکو پارەی کاش کۆبکاتەوە و ژنێکی بەدەست بکەوێ. شەست تەقلەلێدەدات و بە هەموو جۆرێك خۆی دەفرۆشێ و, کاتێك کچێکیش دەدۆزێتەوە لەپەیوەندی سێکسی رەها و چەند منداڵێك بەملاوە هیچ شتێکی تری پێنابەخشێ! هیچ پیاوێك ژیانێکی وا پێشکەش بە ژنان ناکات کە ببێتە سەرچاوەی ژیانێکی ئازاد و یەکسان، ناتوانێ و ناشێ کاری بەمجۆرەش بکات. تەنیا مانگێك لەگەڵ پیاوێکی هەڵبژێردراو، پیاوێك کە خۆشتان گەرەکە و حەزتان لێیەتی لەگەڵیدا بژین، دەبینن کە سەرچاوەی ئەشکەنجەیە. ئەگەر لەماوەیەکی کورتدا ژیانتان لێنەکات بە زیندان چیم پێ دەڵێن بڵێن: من پەسندی دەکەم. بەخشین و ناسینی ئازادی ژنان لەسروشتی پیاودا نییە, بەڵکو دەخوازێ زیاتر مەیلی باڵادەستی و زاڵبوون پێشبخات. لێرەشدا دەردەکەوێ لەکۆمەڵگای ئێمەدا شێوازی پەیوەندی پرپەتی لەشێوازو هەڵوێستی بەمجۆرە. هەڵبژاردەترین و دەگمەنترین پیاوی کورد بەرامبەر بە ژنان کۆتایی پێهاتووە و بەزۆر و زەحمەت ناتوانێ چەند قسەیەکی لەگەڵدا بکات و چۆن لەگەڵیدا بجوڵێتەوە. بەشێوەیەکی راست و دروست نزیك بوون و هەڵوەستەکردن بەرامبەر بەپێوانەکانی رێزگرتن و خۆشەویستی بۆ پیاوان هێندەی تر زەحمەت و سەختە. لەتەواوی نزیکبوونەکانیدا ئەوە بە بناخە دەگرێت کە زاڵ و باڵادەست بێ و موڵکی خۆی بێت و بەخۆیەوە گرێبدات و, هەروەها بیکات بەنەبوو و, تا رادەیەك دەخوازێ بەخۆیەوە گرێبدات کە بیکات بە هیچ. کەسایەتییەکی مشەخۆر دەسەپێنێ، کۆمپلێکس و ( گرێ کوێرە ) تورەیی و کین و نەفرەتی لەئاستێکی بێ

سنووردایە. بەرگەی ئەوە ناگرێ یەكێك مولّكەكەی لەدەست دەربێنی یان یەكێك بەچاوێكی خوار سەیری بكات و تەنانەت قسەشی لەگەڵدا بكات, ئەگەر كاریگەریشی لێكردبێت و پەیوەندی تایبەتییان دروست بووبێت, ئەوا دەبێتە هۆی خوێنڕشتن. دەگوترێ: " تۆ ئەو كەسەی تەماشای كچەكەمت كردووە " بەتایبەتیش ئەگەر ئەمە ژنی بێت جموجۆڵیكی خراپ تاوەكو مردنیشی دەبات. ئەمەش چەمكێكە لەپاشكەوتووترین تیرەكانی باشووری ئەفریكیاشدا نییە. هەروەها گەلێك جار بینراوە كە هەڵوێستێك لەباشووری ئەفریكیا ئازاد و سەربەستە, كەچی لەلای ئێمە بۆتە هۆكاری كوشتن! لەنێو كۆمەڵگای ئێمەدا ژن بە شێوەیەكی زۆر رەها بە مولّك و ماڵی پیاو دەبینرێ. چاوی پیاو لەژنە، گەر یەكێكی تر چاوی لەسەر بێ, یان دەستی بەر بكەوێ، ئەوكاتە دەڵێ نامووسم چوو! گەر ئەمە بێنینە بەرچاو كە تا چ رادەیەك لەنێو كۆمەڵگا دەبێتە هۆی باوبوون و بڵاوبوونەوەی كێشەكانی خوێن, ئەوكاتە دەبینین كە لەئاستێكی چەندە پاشكەوتوودا ین و تا چ رادەیەك رەوشی لەرێ لادانی كۆمەڵگا لەئارادایە. باش دەزانن لەخێزانێكی گوندنشیندا چەمكێكی رەهای مەترسیداری پەیوەندی سێكسی زاڵەو كاتێ ژن دەگاتە بیست ساڵان كۆتایی پێهاتووە! پەیوەندی سێكسی بەشێوەیەكی راست و دروست بەكار ناهێنرێ و, شتێكی بەمجۆرە جێگای باس نییە. لەحاڵێكدا من ئەوە بەخراپەخانەیەكی نێو خێزانی ناو دەبەم. پەیوەندییەكانی خراپەخانەی ماڵی گشتی ( جێی بەدرەوشتی ) یش هەیە. لێرەدا مەزن كردن و بەرزكردنەوەی رەگەز لەئارادا نییە، ژن دەخوازێ مێیەتی خۆی بە شێوەیەكی وروژاندن و بەشێوازێكی خنكێنەرانە بەرامبەر بەپیاو بەكار بێنێ, خۆی لەڕاستیدا پێویست دەكات پەیوەندی سێكسی لەسەر بنەمای شكۆمەندی و پیرۆزیەوە بگیرێتە دەست. نكوڵیكردن لەسێكس بەواتای نكوڵیكردنە لەژیان. بەڵام بەكارهێنانی ئەو پەیوەندییە سێكسیانە بەشێوەیەكی خراپ بەواتای بەهیچ دانانی ئازادی وڵات دێ . عەیب و شورەیی لەملاوە بمێنێ، ئەم بابەتە تەڵەزگەیە و نەخۆشی و هەڵوێستێكە هەڕەشە لەوڵات و گەل و ژیانمان دەكات.

كام ژنەی دەڵێ منم و بەخۆیەوە دەنازێ و بەخۆ باوەڕە، شیمانەی ئەوە دەكرێ لە 90٪ دا لەهەفتەیەكدا ببێتە سەرچاوەی ئەشكەنجە و ئێش و ئازار. یان ئەوەتا زۆر وابەستە و گرێدراو دەبێ و دەگری! یانیش ئەوەتە زۆر بێ هێزە و دەخوازێ هێز بەدەستەوە بێنێ، هەر بۆیە دەبێتە ژنێكی فێڵباز. ژن نەزانە و هیچ شتێكی نییە بە پیاوی ببەخشێ. نەزمانی هەیە قسەی پێبكات، نە سەبارەت بە ژیان خاوەن فەلسەفەیەكە گفتوگۆی لەبارەیەوە بكات، نە هێزێكی وەهای هەیە كە بتوانێ چارەسەركردنی كێشەیەك بسەپێنێ. تەواوی ئەمانەی نییە! بێ زمانە و بەخۆگرێدانی پاشكەوتووانە بەپیاوەكەی بەملاوە هیچ تایبەتمەندێتییەكی نییە. بەمەش هەم پیاو و هەم خۆشی دەخنكێنێ.

لێرەدا ئەوە دەستنیشان كرا كە پێوانەیەكی دروست و پتەوی خێزان نییە، بەڵكو پێوانەیەكی لەنێوبەرانەی خێزان لەئارادایە. ئەم پێوانەیە لەنێو بەرەی خێزانیش گەورەترین كۆسپە لەپێش وڵاتپارێزی و هەموو جۆرە پێشكەوتنێكی ئازادانەی كۆمەڵگا. بێگومان داگیركەریش بە شێوەیەكی زیاتر و سەختتر بەسەر ئەم دەزگایەدا دێت و هەوڵدەدات ئەنجام بەدەست بێنێت، هەر بۆیە بەبڕیارەوە ئەم راستینەیە دەكەینە بابەتی گفتوگۆ.

بەبۆنەی رۆژی ژنانی زەحمەتکێش سڵاو لەتێکۆشانی ئازادی سەرجەم ژنانی جیهان دەکەم, باوەڕ دەکەم کە ئەم کێشەیە بەشێوەیەکی رشت و بەربڵاو کەوتۆتە نێو رۆژەڤی تێکۆشانی کۆمەڵایەتی. پارتیمان PKK بەشێوەیەکی جددی و بەسووربوونەوە لەسەر بەرۆژەڤ بوونی سۆسیالیزم لە دونیادا رادەوەستێ و بۆ ئەوەی ئەم مەسەلەیەش تەنیا لەچوارچێوەی شۆڕشی رزگاری نەتەوەیی کوردستاندا نەمێنێتەوە, هەوڵیداوە سەرەتا لەخۆرهەڵاتی ناوین و پاشانیش بەدونیادا بڵاوی بکاتەوە.

هەربۆیە پێویستە پێش هەموو شتێك باس لەئایدیۆلۆژیای رزگاری ژن بکرێت. ئێمە لەهەوڵی ئەوەداین کە ئەم ئایدیۆلۆژیایە بخولقێنین. چونکە ناتوانرێ بەیەك ــ دوو رووداو و چالاکییەك یاخود هەڵسەنگاندنی روکەشیانە, لەبن باری ئەم کێشە و مەسەلەیە دەربکەوین. ئەگەر بەشێوەیەکی قووڵ لەسەر پێشکەوتنی ئایدیۆلۆژی رزگاری ژن هەڵوەستە نەکرێت, ئەوا رزگاری کۆمەڵایەتیش پێش ناکەوێت و کەسیش ناتوانێ لەم خاڵەدا خۆی هەڵخەڵەتێنێ.

من لەو باوەڕەدام پێویستیەکی زۆر جددی بە ئایدیۆلۆژیای رزگاری ژن هەیە. ئەم ئایدیۆلۆژیایەش تەنیا بەواتای ئایدیۆلۆژیای رزگاری, رەگەزی نییە, چونکە ـ ئەگەر لەبنەماکانی سۆسیالیزمی زانستی بڕوانین, ئەوا دەبینین ئەم ئایدیۆلۆژیایە ئایدیۆلۆژیایەکی کۆمەڵایەتیە, هەڵبەتە بونیادنانی ئایدیۆلۆژیایەك بۆ رزگاری ژنان گەلێك گرنگی خۆی هەیە, ئەمەش روون و ئاشکرایە و یەکێ لەو لایەنانەی کە من بیری لێدەکەمەوە و لێی قووڵ دەبمەوە ئەم بابەتەیە.

بێگومان ئەمە نزیکبوونێکی فێمێنیستی نییە. هەرچەندە من خۆم ژن نیم, وەلێ لەچوارچێوەی تەوەرەی ژن زۆر بایەخ بە بیرکردنەوە سەبارەت بەکێشەی ژن دەدەم, هەروەها بە پراکتیزەکردنی ئایدیۆلۆژیایەك و بەپشت بەستن بەو ئایدیۆلۆژیایەش, پێشخستنی رێکخراوێك یەکجار بەگرنگ دادەنێم. واتە چارەسەرکردنی کێشەکان لەرێگای شەڕەوە, تەنانەت رەخساندنی کەش و هەوای ئاشتییەك بەپشت بەستن بەئازادی, پێویستیان بەپێشخستنی ئایدیۆلۆژیایەکی بەوجۆرە هەیە. چونکە لەسەرەتاوە تاوەکو ئێستاکەش تەواوی ئایدیۆلۆژیاکان مۆرکی پیاوانی پێوەیە و, زیاتر ئایدیۆلۆژیای پیاوانن. بێگومان لایەنی چینایەتییان هەیە, هەروەها لایەنی چەوساندنەوەی ئیمپریالیزمیش هەیە, وەلێ بەشێوەیەکی سەرنج راکێش لەچوارچێوەی باڵادەستی و دەسەڵاتی پیاودایە. کەس ناتوانێت نکوڵی لەمە بکات. هەرچەندە نزیك بوونی باڵادەستی پیاو بەسەر کۆمەڵگادا زاڵ بووبێ و بەسەدان ساڵیش ئەم نزیك بوونە هەمیشە خۆی حەشاردابێ, وەلێ ئەو کەسەی کە تارادەیەك رێزی بۆ زانست هەبێت و تارادەیەکیش هەست بەپێداویستی رزگاری ژن و گەلانی ژێر دەست بکات, کە بەرادەیەکی زۆر پتەو گرێدراوی رزگاری ژنە, ئەوا بێگومان دەسەڵاتدارێتی سەدان ساڵەی پیاوان دەبینێ و هەڵبەتە لەهزری خۆشیدا, پێداویستی ئافراندنی ئایدیۆلۆژیایەك بۆ رزگاری ژنیش بەهەند دەبینێ.

ئەم بابەتـە لەلایـەن ڕێبـەرە سۆسیالیسـت و كۆمۆنیسـتەكانی دیكـەدا كـەم تـازۆر گرنگـی پـێ نـەدراوە و تاوتوێنـەكراوە, ئەگـەر تـاوتوێش كرابـێ, ئـەوا زۆر سـنووردار بـووە و چـەمكی باڵادەسـتی پیاویـان دەربـاز نـەكردووە. بەتایبـەت لـەنێو ژیـانی خۆشـیاندا, لەبنەڕەتـدا چـەمكی باڵادەسـتی بـاوی نێـو خێزانیشـیان تێنەپەڕاندووە. هەربۆیە پێویستە ئەم لایەنە لەسۆسیالیزم دا بەخاڵی لاواز و كەمتەرخەمی لەقەڵـەم بـدرێت. ئەوەی لێرەدا دەمانەوێ باسی لێوە بكەین, هەوڵدانە بۆ دەرباز بوون لەو ڕەوشە.

لەڕاستیدا ئەم ئایدیۆلۆژیایە, ئایدیۆلۆژیایەك نیە كە زۆری و زەحمەتی لەگەڵ خۆیدا بخولقێنێ. لـەقۆناخی سەرەتای هاتنە ئارای كۆمەڵگاوە, لەبنەڕەتدا ئایدیۆلۆژیا لەتەوەرەی ژندا بوو. بۆ نموونە: خوداوەندی مەزن "عەشتار" هەیە. بـەزمانی كـوردی بـەواتای "سـتار ــ سـتێرك " دێـت و یەكـەمین خوداوەنـدە. لەڕاسـتیدا یەكەمین خواوەند, خوداوەندی ژن بوو. خوداوەندە پیاوەكان زۆر درەنگ دەركەوتوون یاخود خوداوەندەكان دوای ماوەیەكی درێژ لەشێوەی خوداوەندە پیاوەكان خۆیان دەرخستۆتە مەیدان. بێگومـان ئـەم راسـتیەش (واتـە ئـەو قۆناخـەش) تـا دواڕادە بـە بەرهـەمهێنانی ژنانـەوە گرێـدراوە. واتـە لەڕاسـتیدا ئایـدیۆلۆژیای ژن, ئایدیۆلۆژیایەكی كۆمەڵایەتییە,نـەك ئایدیۆلۆژیایـەكی ڕەگـەزی. پـێم وایـە ئەگـەر لـەم چوارچێوەیەدا نزیكـی كێشەكە ببین ــ واتە لەلایەنی پرەنسیپ و ئایـدیۆلۆژیاوە ــ ئـەوا بۆمـان دەردەكـەوێت كـە پێویسـت دەكـات سـەرلەنوێ چـاو بخشـێنینەوە بـە سـەرجەم ئـەو هەڵوێسـت, ئایـدیۆلۆژیا و ئـەو ڕێكخسـتنانەی كـە تـاوەكو ئێستاش لەئارادان و لەسەربنەمای ئەم ئایدیۆلۆژیانـە بونیـادنراون ــ واتـە ڕێكخـراوە, ئـابووری, كولتـووری, سیاسـی و سـەربازییەكان ــ بۆچـی؟ چـونكە پیـاو تیایانـدا دەسـەڵاتدارە و هـەروەها لەناوەڕۆكـدا شـەڕ و نایەكسانی و فشار و زۆرداری لەخۆوە دەگرێت و بەرجەستە دەكات. ئەمەش داڕووخانی ڕەگەز لەگەڵ خۆیـدا دەهێنێت. بێگومان داڕووخانی ڕەگەزیش بەواتای رووخانی ژیان دێت. لەدوای داڕووخانی ژیانیش ــ لـەڕووی ژنەوە ئەمە زۆر بەرچاوە ــ بەدیلگرتنی ڕەگەز, بەدیلگرتنی تەواوی كۆمەڵگا لەگەڵ خۆیدا دێنێ و ئەمەش زۆر بەرچاوە و ئەوەی بەگشتی زەرەر و زیانی بەربكەوێت كۆمەڵگایە و, ئیدی لێرە بەدواوە ڕێگە لەبەردەم شەڕی دژوار دەكرێتەوە. هەروەها پێشكەوتنی كارەكتەری شەڕی دژوار, لەتوركیا, نـاوەڕۆكێكی چینایەتی هەیـە و لەو خاڵەوە سەرچاوە دەگرێت و پەیوەندی بەئیمپریالیزمیشەوە هەیـە, وەلـێ بەشـێوەیەكی زۆر بەرجەسـتە پەیوەندی بەچەمكی باڵادەستی شۆڤێنی پیاویشەوە هەیە.

هـەر لەبەرئەمەشـە دەڵـێم نزیكبـوون لەشـێوەی " ئێسـتا كـاتی ئەمـە نییـە, دواتـر دەتـوانرێ ئەمـە ئەنجامبدرێت" تا دواڕادە هەڵە و مەترسیدارە. ئەگەر بخوازین هەر هـەنگاوێك بـەرەو تـەوژمێكی شۆڕشـگێڕی بهاوێژین, یاخود هەر جۆرە چالاكیەكی كۆمەڵایـەتی رشـت ئـەنجام بـدەین, ئـەوا تادێـت گـەلێك پێویسـتیمان بەچالاكییەكی ئایدیۆلۆژی هەیە, كە تەوەرەی ژن بەبنەما وەربگرێ.

لایەن و تایبەتمەندی دووەمیش" بێگومان هەر بەوەوە گرێدراوە و پێویسـت دەكـات بەشـێوەیەكی چـڕوپڕ تەواوی ئەو ڕێكخراوانەی كە زیاتر مۆركی پیاویان پێوەیە, ڕەخنـە بكـرێن. ئەمـەش تـەنیا بەڕەخنـە لێگـرتن تەواو نابێت, بەڵكو پێویستە ئیدی دەست لەوە بەربدرێت و دەرباز بكرێت, ئەگینا بەشێوازێكی دیكە كۆتـایی بەم شەڕە نایەت و ئاشتیش بەرقەرار نابێت. سـەیری تـەواوی ڕێكخـراوە میلیتاریـەكان بكـەن, لەسـەدا سـەد

مۆرکی پیاویان لەخۆوە گرتووە. لەنێو ئەو ڕێکخراوانەدا جێگەی ژنێك، زمانی ژنێك، دڵی ژنێك چییە، بوونی نییە و سەرتاپای ئەو ڕێکخراوانە ڕێکخراوی چەوسێنەر، ڕێکخراوی توند و تیژین. ئەگەر سەرنج بدرێتە ئەو جێگایانەی کە ژمارەیەکی کەمی ژنی لێ بێت یاخود هەر لێی نەبێت، ئەوا دەبینین لەو جێگایانەدا سیستەمێکی زۆر توند و دژوار لەئارادا دەبێت. بێگومان ئەمەش راستی بیروبۆچوونی ئێمەیە. ئەو دەزگایانەی کە زیاتر باڵادەستی پیاوی تێدایە، لەسەرووی هەمووشیانەوە دەزگا ملیتاریستەکان، ئامرازی شەڕی زۆر دژوارن. واتە لەدژی ئاشتی و ژیانن.

پێویست دەکات ئەو دەزگایەی کە ژن نغرۆ دەکات و دەیخنکێنێ، واتە دەزگای خێزان زۆر بەجدی رەخنە بکەین

هەربۆیە ئەگەر رزگاری ژن بخوازین، پێویست دەکات زۆر بەتوندی رەخنە لەو دەزگایانە بگرین کە پشتیان بەئایدیۆلۆژی باڵادەستی پیاو بەستووە. پارچەی هەرە گرنگی ئەو دەزگایانەش دەزگای خێزانە.

خێزان ئەو دەزگایەیە کە پیاو تێیدا باڵادەستە. هەرچەندە من لێرەدا نامەوێت زۆر لەسەری بدوێم، وەلێ مسۆگەر ئەو دەزگایەی کە دەبێ هەڵوەستەی لەسەر بکرێت، بەتایبەت لەچوارچێوەی کۆمەڵگای کوردەواریدا، دەزگای خێزانە. پێم وایە دەزگای خێزان ئەو " بیر "ە مەترسیدارە قووڵ و بێبنەیە. کە لەبنەمادا دەبێتە هۆکاری داڕووخانی ژن و پیاو. لەڕاستیدا نازانن تا چ رادەیەك داڕووخاون و کەوتوونەتە نێو قووڵایی و تاریکیەوە. ئەگەر سەیر بکرێت تەواوی سیستەمە ئیمپریالیست ــ چەوسێنەرەکان، هەروەها تەواوی سیستەمەکانی شەڕی تایبەت، ئەو زەمینەیەی کە بەبنەمایان گرتووە بۆخۆیان، دەزگای خێزانە. بۆیە پێویستە بەبایەخەوە چاو بەم رەوشەدا بخشێنرێت و رەخنە بکرێت. ئەمە بەو واتایە نایەت کە ئێمە بەتەواوی نکوڵی لەزاراوەی خێزان بکەین. نەخێر ئێمە لێرەدا باس لەپێداویستی بەلاوەنان و دەربازکردنی ئەو شێوە خێزانە دەکەین کە ئێستا لەئارادایە. زاراوەیەکی بەمجۆرە گرنگییەکی خۆی هەیە. لەنێو خێزاندا دیکتاتۆریەت و موڵکی تایبەت هەیە و تادواڕادە بەچاوێکی نزمەوە سەیری ژن دەکرێت و بەشی هەر ئێش و ئازارە و، لەهەموو ماف و یاسایەك بێبەریە. لەلایەنی جەستەییەوە، پێش هەموو شتێك داڕزاندنی ژن هەیە و داخوازیەکی جددی تایبەت بەخۆی لەئارادا نییە. هەر لەبەرئەمەشە ئێوە باس لەبوونی هەست و سۆزی ژن دەکەن. بێگومان ئەگەر تەواوی هەلومەرجەکان بەمجۆرە بێت، ئەوا ژن دەبێتە بوونەوەرێکی وابەستە، بگرە بوونەوەرێك کە تەنیا لەچوارچێوەی هەست و سۆزەکانیەوە ژیان بەسەر بەرێت. ئەمەش خۆی لەخۆیدا نیشاندانی مەزنترین بێ رێزی و درندانەترین هێرش کردنە لەبەرامبەر مافەکانی مرۆڤ. هەربۆیە ئەگەر بخوازین باس لەڕزگاری ژن بکەین، پێویست دەکات ئەو دەزگایەی کە ژن نغرۆ دەکات و دەیخنکێنێ ــ واتە دەزگای خێزان ــ زۆر بەجددی رەخنە بکەین.

شانبەشانی ئەم رەخنەیەش زاراوەیەکی دیکە هەیە کە دەبێ پێشبخرێ، ئەویش زاراوەی " دابڕانە."

لەوانەیە ئەمە هەندێك لەئێمە هەراسان بکات، وەلێ پێویستە لەڕوانگەی ئایدیۆلۆژیای ئازادییەوە ئەمە روون بکەینەوە. بێگومان ناکرێ تەواوی خێزانەکان تەفلی تێکۆشان بن، ئاشکراشە کە لەتوانای هەرکەسدا نییە کە ئەم دەزگایە دەرباز بکات، ئێوەش ناتوانن ئەمە دەرباز بکەن. چونکە ئەگەر ئەو هێزەتان هەبووایە ئەوا

ئێستا دەبوونە سەرۆکێکی مەزن و دەبوونە جەنگاوەرێکی مەزنی تێکۆشانی رزگاری. تەنانەت منیش ناتوانم ئەوە دەرباز بکەم. تا ئێستاکەش ئەگەر رۆژانە کۆنترۆڵی خۆم نەکەم, ئەوا دەتوانێ منیش قووت بدات. ئەم کێشەیە یەکجار سەختە. هەروەکو دەزانرێت کێشەی کونە رەشەکان هەیە (ئەم کونە رەشانە تیۆرێکی ئەنیشتاینە کە, دەڵێ لەئاسماندا کونی رەش هەن کە گەردوون لەپیسی و پاشماوەکان پاك دەکاتەوە — وەرگێڕ) ئابەمجۆرە ئەو دیاردەیە هەموو شتێك قووت دەدات. ئەو دەزگایە بەهەزارانساڵ پێش ئێستا پێکهاتووە و سەریهەڵداوە.

بێگومان ئێمە هەوڵدەدەین کە کێشەی کورد چارەسەر بکەین. واتە لەمیانەی هەوڵەکانم بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد, ئەو مەسەلەیەی کە لەهێزە ئیمپریالیستەکان و داگیرکاری زیاتر بەشێوەیەکی مەترسیدار لەبەرامبەرمدا قووت دەبێتەوە, مەسەلەی خێزانە. هەر لەبەرئەمەشە کە رۆژانە بەشەرڤانەکانمەوە خەریك و سەرقاڵ دەبم. بەقارەمانانەترین جەنگاوەرەکانی خۆمانەوە خەریك دەبم. ئەگەرچی شەڕێکی قارەمانانە دەکەن, وەلێ زۆر بەئاسانی شەهید دەکەون, هەربۆیە دەمەوێ رێگا لەم رەوشە بگرم, بۆچی دەکەونە نێو رەوشێکی بەوجۆرە؟ بۆچی ئەو لاوانە ـ بێگومان مەبەستمان کچانیشە — بەوشێوەیەی کە چاوەڕوان ناکەین, بەرەوپیری شەهیدبوون دەچن؟ پێویستە ئێستا ئەم رەوشە چارەسەر بکەم. جا بۆ چارەسەرکردنی ئەوە, بەداخەوە, ناچارم هەڵسم بەتاوتوێکردن و باسکردنی چۆنیەتی مەزنکردن و پێشخستنیان.

لەڕاستیدا چۆنیەتی پێگەیاندن و بەخێوکردنی منداڵ لەتەمەنی (7) ساڵیەوە, خۆی لەخۆیدا کێشەیەکە. شێوازی بەخێوکردن و پێگەیاندنی منداڵ لەنێو خێزان, تادواڕادە خراپە و بەرەو نەمانیان دەبەن. بێگومان ئەمە ئازارێکی مەزنە. دایکێك بۆ منداڵێکی خەمبار دەبێت, وەلێ من بەهەزاران هەڤاڵی وەکو چیام هەن. تەنیا لەدڵدا بیرکردنەوە لەوانە بەس نییە, بەڵکو پێویستە ئەوانە لەمێشکدا چارەسەر بکەین, پێویستە تەمەنیان درێژبکەینەوە. هەڵبەتە ئەمە کێشەیەکی زۆر مەزنە. هەربۆیە دەڵێم: ئاخۆ ئەوەی تائەو رادەیە پیاو لەناو دەبات چییە؟ ئایا ئەو شتانەی کە پیاو لاواز دەکەن چین؟ لەم خاڵەدا پیاو بیر ناکاتەوە و تۆزقاڵێکیش چییە ئەو مەترسییانە نابینن کە لەئارادان. من ئەم مەسەلەیە تاڕادەیەك بە دەزگای خێزانەوە گرێدەدەم. بێگومان هەرلەبەر ئەمەشە کە شەڕ وەك پێداویستی و چارەسەیەك لەقەڵەم دەدەم و ئەنجام دەدەم. لێرەدا گەلێك لایەن و خاڵی دیکەش هەن. بێگومان مەبەستی من رزگارکردنی هەموو خێزانێك نییە. یاخود ناڵێم:" هەمووتان وەرن لەگەڵ خێزانەکانتان تەڤلی ئەم شەڕە بن". هەڵبەتە ئەگەر ئێمە ئەمەش بخوازین, ئەوا بەوجۆرە نابێت و پێویست ناکات. وەلێ ئەم زاراوەیە بەم شێوەیە ناهێڵینەوە و شێوەیەکی پێشکەتووتری دەدەینێ" بۆ ئەم مەبەستەش کچ و کوڕی پێشکەوتوو دەخولقێنین. بێگومان بۆ مەیسەر بوونی ئەمەش پێویست بەدابڕانێکی مەزن دەکات.

ئێستا گەلێك لەنووسەران پێمان دەڵێن: " ئەنجامدانی ئەوە زۆر زەحمەتە." کچ و کوڕ کە دەگەنە تەمەنی (18) ساڵە دەکەونە نێو ئەشقێکی کوێرانەی سەیر, ناچاریشن بکەونە نێو ئەم رەوشەوە ـ لەکاتێکدا منیش بەو شێوەیە بووم, هێنانە زمانی ئەمە شەرم نییە — وەلێ لەهەمانکاتیشدا داڕووخانێکی مەزنە. بەمجۆرە

چەمکی ئەشقی کوێرانە, بەدڵنیاییەوە بەواتای بەرکەوتنی گورزی کوشندەی دووەم دێت. لەڕاستیدا ئەشقی کوێرانەی بەمجۆرە, خۆی لەخۆیدا بەواتای پچڕاندن لە هزر دێت و کردنەوەی دەرگایە بەشێوەیەکی بوێرانە لەبەرامبەر هەر جۆرە کۆیلایەتییەك! واتە داڕووخانی سۆز و هزر بەواتای داڕووخانی هێز دێت. کاتێك کچ و کوڕی گەنج دەگەنە تەمەنی (20) ساڵان, جێ و شوێنیان لەنێو بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتییدا, کۆتایی پێدێت و, بەرهەمهێنان لای ئەمان کێشەیەکی زۆر مەزنە. ئەو شێوە مرۆڤانە لەنێو ریزەکانماندا زۆر کێشەمان بۆ دەردەخەن.

ئێمە لەم رووەوە شەهیدانی ژنی مەزن بۆ خۆمان بەبنەما دەگرین. من هەموو کاتێك دەڵێم: بەدڵنیاییەوە راستی زیلان, (زەینەب کناجی )یەکان بۆ ئێمە وەسیەتێکن!

من نەمدەخواست چالاکییەکی وەها ئەنجام بدات, وەلێ لەسەر بڕیاری خۆی بەم چالاکییە هەڵساوە. سێ نامەی لەشێوەی وەسییەت هەیە کە بۆی بەجێ هێشتووین. ئێمە ناچارین هەمیشە ئەو وەسیەتانە بەهەند وەربگرین. لەڕاستیدا ئەو وەسیەتنامانە لەشێوەی مانیفێستۆیەکدان ئەو رێگەیەمان نیشان دەدات کە دەبێ چۆن بژین, یاخود چۆن شەڕ بکەین. بەهیچ جۆرێك ناتوانین بێ رێزی لەبەرامبەر هزر, ئایدیۆلۆژیا, چەمکی رێکخستنی و تەنانەت بەچەمکی چالاکییەکەی بنوێنین.

ئەگەرچی ئەم ژنە (هەڤاڵ زیلان) مێردی کردبوو. وەلێ لەکەسێتی خۆیدا گورزێکی مەزنی لەدەزگای خێزان وەشاندبوو, هەروەها حەزکردنێکی زۆر مەزنی بۆ ژیان هەیە و ئەمەش بەو چالاکییەی کە نواندی بەرجەستەی کرد. ئەمەش بۆ ئێمە دیاردەیەکی مەزنی شکۆمەند بوونە. کاتێك چاوپۆشی لەوانە بکرێت جێیەك بۆ ئاخافتن نامێنێتەوە. لەڕۆژانی بەمجۆرەدا, پێویستە کەسایەتی لەو جۆرە بەبنەما وەرگرین. لەڕاستیدا ئێمە ئەوانە, وەکو پیرۆزترین کەسایەتی لەقەڵەم دەدەین. ئەگەر سەرنج بدرێت, ئەمجۆرە چالاکیە لەمێژووی مرۆڤایەتیدا زۆر سنووردارە و کەم وێنەیە و رەنگە ژمارەی پەنجەکانی دەستێك دەرباز نەکەن. هەربۆیە باشترین شێوەی پەیوەستبوون بەم چالاکییەوە مەگەر بەم شێوەیە دیاری بکرێت. چونکە ئەوانە بەهای پیرۆزن. لەمێژوودا "عەزیزە" پەری هەن ( واتە ئەو ژن و پیاوانەی کە لەسەر رێبازی ئایینی مەسیحی دەستیان لەئارەزووەکانی ژیان بەردابوو ـ وەرگێڕ ) دەبێت ئەم کەسایەتیانە لەو ئاستەدا بگرینە دەست, لێرەشدا "دابڕانێکی" مەزن لەئارادایە.

ئەو دابڕانە تەنیا دابڕان نییە لەپیاو, بەڵکو لەتەواوی سیستەم, جیهان, چەپەڵیەکان و لەتەواوی کۆت و بەندەکان, بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر, خۆپچڕان و دابڕان هەیە, من پێم وایە ئەوە دیاردەیەکی مەزنە. ئەوەی دەکەوێتە ئەستۆی ئێمە کە هەڵسەنگاندن و بەتیۆری کردنێتی و بینینێتی وەکو فەرمانێك, واتە ئەگەر بەهای پێببەخشین ئەوا ئەم دیاردەیە ئەم ئەنجامانەمان بۆ دێنێتە ئاراوە. رەنگە لەنامەکاندا بەتەواوی باس لەمانە نەکرابێ, وەلێ بەخوێندنەوە و شیکردنەوەی وشە بەوشەی, راستی و دروستی ئەو ( واتە هەڤاڵ زیلان ـــ وەرگێڕ ) نیشان دەدەین و لەکەسایەتی خۆشماندا پێك دەهێنین. لەدەرەوەی ئەمەش باسکردنی "زیلانەکان" دەبێتە دووڕوویی. بەلای منیشەوە کاری هەرە مەترسیدار لەم رووەوە, دووڕووییە, هەڵبەتە

ئەمەش تەنیا بەلێگەڕینی ئازادی ژنەوە سنووردار ناکەین. بەڵکو پێویستە وەڵامی ئەو پرسیارەش بدەینەوە کە ئەمەیە: "جێگا و شوێنی ژن لەئازادبوونی پیاودا چییە؟"

لەپێناو کورداندا تیۆرییەکی نوێی ئەشق دەخولقێنین.

ئێمە باسی کوشتنی پیاوێتیمان کرد و لێرەشدا دەخوازم باس لەو پیاوێتیە بکەم کە لەخودی خۆمدا بەرجەستەم کردووە, ئەمەش بۆ ئەوەیە کە هیچ کەسێك تاوانبار نەکەم و لەم رووەوە دەڵێم سەرەتا خۆمم, (واتە پیاوێتی کلاسیك) کوشت. ئەمە لەلای من فەلسەفە و ئایدیۆلۆژیایەکە. هەر بەو پێیەشە دەژیم و پاشەکشێ لەمەش ناکەم. من نەفرەت لەو پیاوێتییە دەکەم کە سیستەمی ئێستا خوڵقاندویەتی, پیاوێتیەکی وەها بەسەرچاوەی داڕووخانێکی مەزن و چەپەڵی و زەلیل بوونێکی مەزن هەڵدەسەنگێنم. بەلای منەوە لەڕێی پیاوێتیەکی وەهاوە, هەڵکردن لەگەڵ ژنێکدا سەخترین ئەشکەنجەیە. نەبووە و ناکرێ بکەومە نێو ژیانێکی بەمجۆرە. من بەوە دەڵێم داڕووخان و فشاری مەزن. چونکە لێرەدا" تەواوی درۆکان و, بەیەکگەیشتنی ئەو هەستانەی کە بێ سنوور مرۆڤ لاواز دەکەن, لەگەڵ هەڵوێستە چەپەڵەکان, تێکچڕژاو دەبن.

بێگومان لایەنی دووەمی ئەم بابەتە کە بەچڕوپڕی هەڵوەستەی لەسەر دەکەم, گشتگیرترە و هەموو کەسێك پەیوەندیدار دەکات. هەوڵمداوە زیاتر ئەم لایەنە بۆ کۆمەڵگای کوردەواری روون بکەمەوە و بەرجەستەی بکەم. بەدڵنیاییەوە ئەمە بەواتای "تیۆرییەکی نوێی ئەشق". دێت. لەوانەیە لەکاتێکدا کە لەپێناو کوردان شەڕ پێشدەخەین بڵێن:" ئەم ئەشقە لەکوێوە دەرکەوت؟".

لەڕاستیدا گەلی کورد نوێنەرایەتی گەلێك دەکات کە بێ بەشکراوە لەئەشق و خۆشەویستی. ئەمەش لەئاستێکدایە کە زەحمەتە باوەڕ بکرێت "ئەشقی کورد" وشك کراوە و دووچاری کۆکوژی بووە. لەڕاستیدا ژمارەیەکی زۆر لەو کەسانە هەن کە بەرۆشنبیر دەناسرێن. وەکو دەزانن رۆشنبیرخەریکی ئەدەبیات و هونەرن و گوایە لەهەوڵی ئەوەدان کە دڵی مرۆڤ شیبکەنەوە و لێی بکۆڵنەوە, بەڵام بەداخەوە کە باس دێتە سەر باسی کوردان هیچ زانیاریەکیان نییە و پێی نامۆن, دڵی کورد لەکوێیە و کەی دڵی لەدەست داوە؟ ئەو دڵەی کە کورد ئێستا خاوەنێتی دڵی کێیە؟ هەست و سۆزی کورد, هەست و سۆزی کێیە؟ ئەگەر رۆحێکیش هەبێت, ئەوا ئەو رۆحە رۆحی کام بێگانەیە؟ رۆحی بەکێوە گرێدراوە. ئەمە کامە رۆحی غوڵامییە؟ ئەمە چ بێویژدانی و چ بێ چارەییەکە؟ پێویستە سەرجەمی ئەم پرسیارانە روون بکرێتەوە و وەڵامیان بدرێتەوە.

300 ساڵ پێش ئێستا, ئەحمەدی خانی لەپەرتووکەکەی خۆیدا کەناوی " مەم و زین"ە ئاماژەی بەئاخافتنێك کردووە, بەلای منەوە هێشتا گرنگی و بایەخی زۆری هەیە کە دەڵێ: " لەبەرئەوەی کوردان بێ ئەشق و بێ عیرفانن, ئەوانیش خاوەنی ئەشق و عیرفان و زانستن, بۆیە من ئەم پەرتووکە دەنووسم " لەڕاستیدا ئەمە ئاخافتنێکی بەنرخە, ئەگەر سەرنج بدرێت تەنانەت لەو سەردەمەدا باس لەپێداویستی ئەشق و عیرفان دەکات بۆ کوردەکان. لێرەدا ئەوەی 300 ساڵ پێش ئێستا هەبووە لەدەست دراوە. تەنانەت ئەشقی مەم و زینیش بە ئەنجام نەگەیشت و هەردووکیان مردن و سووتان. بگرە ئەوەندە لانەواز بوون کە

نەیانتوانیوە وتەیەك بدرکێنن. بێگومان ئەمەش لەنێو راستینەی کۆمەڵگای ئەو سەردەمەدابووە. لەرۆژی ئەمرۆشماندا کێشەیەکی بەو جۆرەمان هەیە ئێوە باسی " هاوسەرێتی, خێزان " دەکەن, منیش لێرەدا ئەم پرسیارەتان ئاراستە دەکەم: ئایا ژیان بێ ئەشق, یاخود ژیان بێ خۆشەویستی بوونی هەیە؟ ئەگەر بوونی نییە و لەنێو چووە, ئەوا ئاخۆ ئێمە چۆن بتوانین ئەمە بخولقێنین؟ پیاوان چۆن بیر دەکەنەوە؟ ژنان چۆن بیر دەکەنەوە؟ من بەش بەحاڵی خۆم هەست بەئێش و ئازار دەکەم, تەنانەت قێزم دەبێتەوە. واتە هەر لەبەرئەمەش بوو کە سەرەتا رەخنەم لەخێزانەکەی خۆم گرت. لەسەر ئەم بنەمایەش لەگەڵ باوکم و دایکم کەوتمە شەڕەوە. من وتم: ئەمە چۆن خێزانێکە؟ پاشان تێگەیشتم و بینیم کە ئەم رەوشە چیرۆکی تێکڕای کۆمەڵگایە! بەڵام ئاخۆ دەبوو ملی بۆ کەچ بکەین؟ ئایا دەبوو واز لەژیان بێنین و لەخولیای ژیان و ئەشق پەشیمان بینەوە؟! چونکە کاتێك سەیری مێژوو دەکەی بەتەواوەتی زەوت کراوە.

**ئێمە بۆچی "YAJK"مان بونیادنا؟**

ئاواکردنی YAJK بۆ ئەوەنیە کە ژن بەشێوەیەکی فۆرمی بخەینە ناو شەڕ, با کەس لەمە بەهەڵە تێنەگات, ئێمە YAJKمان بۆ ئەوە بونیادنا کە نەك پیاوی دەرەوە, بەڵکو بۆ ئەوەی پیاوەکانی نێو ریزەکانمان بگۆڕن و رایان کێشنە سەر راستییەکان. چونکە پیاو ناخوازێت تۆزقاڵێك چییە نزیك بوونی خۆی بگۆڕێت. من باسی ئەشق و هەست و سۆزم کرد. تەنانەت پیاو نازانێت لەبەرامبەر ژنێکی هەرە ئازاددا حورمەت بنوێنێ. پێویستە پیاوی وەها بگۆڕین. یەکێ لەو تەگبیرە فۆرمیانەی کە وەرمان گرتووە, لەم بابەتەدا رێکخستن و دامەزراندنی " YAJK "ە.

لەم دواییانەدا ئاماژەم بەوە کرد, لەبەرامبەر ئێمەدا, منیشی لەنێودا, خۆتان بەباشی رێکبخەن. چونکە وتم لەراستینەی پیاواندا, مەترسی دەبینم. هێشتا گۆڕانکاری ـــ وەرچەرخان لەکەسێتی پیاواندا رووی نەداوە. پیاو نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە بەیەکسانی ئازادی و بەرێز و خۆشەویستەوە لەژن نزیك ببێتەوە. ئەمە روون و ئاشکرایە و هەموو کاتێکیش جەخت لەسەر ئەمانە دەکەمەوە. سەرباری ئەو هەموو هەوڵ و کۆششەی لەپێناو ژندا داومە و سەرەڕای سەرقاڵ بوونم تا ئەم ئاستە بەشەڕەوە, دەتوانم سەبارەت بەمە تاڕادەیەك کۆنترۆڵی خۆم بکەم. هەربۆیە وتم: کۆنترۆڵی هەست و سۆزەکانتان بکەن. ئەگەر لەتواناتاندا هەیە خۆتان رێکبخەن و لەپێناو گۆڕینی ئەو شێوە پیاوانە هێزتان, تۆکمەتر بکەن. چونکە ئەو زۆردارانە, ناتوانن شتێك ببەخشن بەبێ چارەکان. ئەگەر زیاتر YAJK رێکبخەن و بەهێزی بکەن, ئەو کات پیاو ناتوانێت وەکو رابردوو هێرش بکات. ئیدی پیاو بەپشت بەستن بەو هێزەی کە هەیەتی ناتوانن وەکو جاران بڵێت:" بەو شێوەیە لەو کچە نزیك دەبمەوە". ئێمە ئەو رەفتارانەمان تێکشکاند, ئەمەش خۆی لەخۆیدا پێشکەوتنێکی مەزنە. ئێوە پرسیار دەکەن و دەڵێن: ئێوە چۆن کێشەی خێزانتان چارەسەرکرد؟ ئێمە لەوەڵامدا دەڵێین: بەم شێوەیە چارەسەرمان کرد, واتە لەشوێنی ئەوەی بەشێوەیەکی هەرزان بەدوای بەدەستخستنی ژنێکەوە بن یاخود بەدوای ژنی هەرزانەوە رابکەن, سەیر بکەن راستینەی " زیلان" لەئارادایە, لەڕاستیدا ئەو ژنە ژنێکی پیرۆز و بەنرخە. بەشکۆمەندییەوە سەری خۆی هەڵبڕی و چالاکی گەورەی خۆشی جێ بەجێ کرد و نامەکانی خۆشی نووسی و پەیمانی داو پەیمانەکەی خۆی پێکهێنا. من ئێستا پێتان دەڵێم کە تادوایی رێزی

ئەو ژنە دەگرم. رەنگە ئێوە ئەمڕۆ یان سبەی لەبیرتان بچێت, یاخود بەشێوەیەك لەبیری بكەن, وەلێ وەسیەتێكی بۆمان بەجێ هێشتووە. بەواتایەكی تر هەرگیز دەستبەرداری وەسیەتەكانی شەهیدان نابم. لێرەدا من دەڵێم:" ئەگەر ئەمە پەیڕەوكردنی كارێكی یەكجار سەختیش بێت, ئەوا دەبێ پەیڕەوكەری راستییەكی وەها بن.

لەكۆمەڵگایەكدا كە باڵادەستی پیاو حاكمە تەنانەت زمانی ژنیش دەبڕدرێت.

لێرەدا ناكۆكیەك سەرهەڵدەدات. ئەویش ئەوەیە كە ئایا دابڕان, بەسەرلەنوێ بەشداریكردن و, سەرلەنوێ دابەشكردن فەراهەم دەبێت؟ ئەگەر ئەمە فەراهەم ببێت, ئەوا پیاو ناچارە سەرلەنوێ خۆی بونیاد بنێ ئەمەش بە یەكەم: وشیاری و دووەم: ئازادیخوازی و ئیرادە, سێیەم: سەركەوتوویی, بەدی دێت. من بەردەوام ئەم نموونەیە دەهێنمەوە, ئەگەر سەیری هێلانەی چۆلەكە بكرێت ئەوا دەبینین كاتێك مرۆڤێ دەستی بەرهێلانەكەی یاخود هێلكەكانی نێو هێلانەكە بكەوێت, چۆلەكەكە دەست لەو هێلانەیە بەردەدات. ئێمەی كوردیش جێگایەكمان نەماوە داگیر نەكرابێت. بگرە بستێك خاكمان نەماوە. ئەگەر خاوەنی مێشكێكی وەك چۆلەكەش بووینایە, ئەوا بێگومان ناتوانرێت لەهێلانەیەكی بەمجۆرە ( واتە كوردستان )دا خێزانێكی بەناموس پێكبهێنرێ. پێویستە ئەم راستیە بزانن, چۆلەكە خۆی لەخۆیدا بوونەوەرێكی سروشتییە, هەروەكو گوتم: دەستێكی بێگانە بەرهێلانەكەی بكەوێت, سەرهەڵدەگرێت و ناگەڕێتەوە نێو ئەو هێلانەیە. چونكە هەست بەبوونی مەترسی دەكات و دەڵێ: ئەم هێلانەیەی من دەستی حەرامی بەركەوتووە. ئەمەش لەكاتێكدا بەسەدان ساڵە یەك پارچە لەخاكی ئێمە نەماوە كە دەستی حەرامی بەرنەكەوتبێت و داگیرنەكرابێت. كاتێك من ئەم راستیە دەڵێم, لەوانەیە بڵێن: " ئایا ئێمە نەژین؟ "لەوەڵامدا دەڵێم: بەڵێ دەبێ بژین, وەلێ پێویستە ئەم راستینەیەش ببینن و چارەسەریشی بۆ بدۆزنەوە.

ئەگەر ئەم مەسەلەیە چارەسەر نەكەین چیمان بەسەردا دێت؟ ئاشكرایە ئەمەی لێدەكەوێتەوە, كورد ناتوانێ لەسەر خاكی خۆی نیشتەجێ ببێت. هەموو كەسێك دەگری, كوردستان بەتەواوی چۆڵكرا. كوردێك لەكوردستان نەماوە كە بڵێ: من كوردم و من دەمەوێ بەئازادی بژیم و من بەشەرەفم. من لێرەدا دەمەوێ باسی گەریلایتان بۆ بكەم. بەڕاستی لەڕەوشێكی زەحمەتدا ژیان بەسەر دەبەن. ئەگەر رەوش وابێت من چی بكەم! پێویستە ئێمە نكوڵی لەخۆمان نەكەین و بەئازادی بژین, وەلێ دەبێ راستی مەسەلەكانیش ببینین. ئەگەر هێزی چارەسەریتان بۆ ئەمە نەبێت, ئەوا ناتوانن رشتبن لەسەرمانەوە لەوڵات و هەروەها ناشتوانن بە وشیاری و ئیرادەی خۆتان پێدابگرن لەسەر پەیوەندی ئازاد و یەكسان. ئێوە دەپرسن كە ئێمە چۆن ئەو كچانە بژێنین؟ بێگومان بەپارە نابێت. چونكە پارە خۆی لەخۆیدا زۆرداریە و بەواتای موڵك و سامان دێت. ئەم دیاردەیەش هەمیشە لەبەرامبەر ژن بەكارهێنراوە.

باشە ئەگەر وابێت دەبێ نەژین؟

ئالێرەدا و لەم خاڵەدا پێویستیەكی زۆرمان بەتیۆرییەكی ئەشق و تیۆرییەكی خۆشەویستی هەیە كە زۆری و زەحمەتییەكی زۆری هەیە. پێویستە دڵ و دەروون فراوان بكرێت, ئیدی پێویست دەكات كچەكانیشمان خۆیان بناسن و بىن بەخاوەنی ناسنامەی كەسایەتی خۆیان. لێرەدا من و پیاوانیش بێ ئەوەی زویر بین, بۆ

نموونە, دەبێ بەڕاشکاوی باس لەوە بکەن کە چ جۆرە پیاوێك دەخوازن. هەڵبەتە ئەمە هەم مافی ئێوەشە و هەم ئەرکێکی ئێوەیە. چونکە پیاو گرگنێکی خۆ بە زل زانە و خۆی بەئاغا و کوڕە میر لەقەڵەم دەدات. لەلای ئێمە هەر پیاوێك بەگوێرەی ئایدیۆلۆژی فیوداڵ, هەمیشە خۆیان لەشوێنی ئاغا و سەرۆك عەشیرەت و...هتد دادەنێ. سووکایەتی پێکردن و یاری کردن بەهەست و سۆز و لێدانی ژن بەمافی رەوای خۆی دەبینێ. ئەم رەوشە روون و ئاشکرایە. ئاخۆ دەتوانم هەر بەتەنیا بەسەر ئەم رەوشەدا زاڵ ببم و هەڵی بوەشێنمەوە؟ نەخێر. پێویستە ئێوە خۆتان رێکبخەن. مادام داوای ژیانێکی پشت ئەستوور بەئازادی و یەکسانی دەکەن, ئەوا دەبێ باجی ئەوە بدەن. ئەوەی من دەیڵێم ئەوە نییە کە یەکسەر بێن و بەخێرایی شەهید بکەون. تەنیا چەك لە شانکردنیش بەواتای خۆسەلماندن نایەت. ئەمە نزیکبوونێکی هەڵەیە, پێویستە هەست و سۆزەکانتان رێکبخەن. دەبێ هێزی هزری ئازادی خۆتان بونیاد بنێن. پێویستە ئەوە دیاری بکەن کە دەخوازن لەگەڵ پیاوێکی چۆن بژین, یاخود لەگەڵ چ جۆرە پیاوێك ژیان بەسەر بەرن؟ بۆ ئەمەش پڕۆژەی خۆتان پێشبخەن. سەرنج بدەن لەکۆمەڵگای کوردەواریدا کە دەسەڵاتی پیاو باڵادەستە, تەنانەت زمانی ژنیشی تێدا بڕاوە. دایك و باوکی پێی دەڵێن:"مێردمان بۆت دۆزیوەتەوە ". گەرچی ئەمە لەلای بۆرژواکانیشدا هەر بەو جۆرەیە, وەلێ لەلای ئەوان لەڕووی شێوازەوە تاڕادەیەك جیاوازە. کچ سەیر دەکات, ئەگەر پیاوێکی دەوڵەمەند ببینێ و موچەی باش بێت, ئەمەش لەکچێکی لادێیی خراپترە, بەرەو پیری نزیکبوونێکی وا دەچێت. لێرەدا ژیانێکی پشت ئەستوور بەئایدیۆلۆژیای ئازادی ژن لەئارادا نییە.

باشترین پیاو کە من دەیبینم هیچ شتێکی دیکەی نییە لە ئارەزووە غەریزییەکانی بەولاوە. بەڕاستی لەلای ژن هەندێ لایەنی باشتر دەبینم. چونکە لەبەرامبەر ژیاندا ژن لەپیاو زیاتر خاوەن چەمك و بەویژدانە. ئەو چەمك و ویژدانانە لەلای پیاو زۆر بەخراپی وشك بوون. ئێوە لەگەڵ ئەم جۆرە پیاوانە چی دەکەن؟ ژنێك نییە ئێستا کە گلەیی خۆی لەخێزان نەکات ـ ئەگەر کۆیلە نەبێت ـ من لەلای خۆمەوە بیرم کردۆتەوە کە بەم تێکۆشانە دەبێ ئەمە ئەنجامبدرێت. لەڕاستیدا من بەشێوەیەکی رەمەکی باس لەتیۆری ئەشق ناکەم. پێویستە زیاتر لەم وتانە تێبگەن. چونکە بەڕاستی تیۆری ئەشق, تیۆری شەڕە. ئەگەر کەم تازۆر پەرتووکەکەی " ئەحمەدی خانی" هەڵبسەنگێنین, ئەوا لەدوو توێی پەرتووکەکەیدا, باسی داستانی ئەشقی کردووە. وەلێ دەرئەنجام کلێپە بەکلێپە سووتان بووە. "مەم"یش کوڕی بەگێکی بەناوبانگە, سەرەڕای ئەوەش لەنێو رەوشی بێ چارەییدا دووچاری نەخۆشی شێرپەنجە دەبێت و دەمرێت. پێویستە زۆر بەباشی هەڵوەستە لەسەر ئەم رەوشە بکرێت.

مەم و زین هێزێکی وایان نییە کە بتوانن ژیان بەسەر بەرن. لەڕاستیدا ئەوەی لەپێش 2000 ساڵیشدا هەبووە, ئێستا ئەوەش نەماوە و لەدەست چووە, ئەوەی ئێستا ماوەتەوە شێوازێکی ژیانی مێرووستانی و گرگنیە.

ئێستا من بەوە ناڵێم ژیان. رێزم لەبەرامبەر ژیاندا هەیە. خۆی لەخۆیدا یەکێ لەو تایبەتمەندییانەی کە دەستبەرداری نەبووین, تایبەتمەندی رێزگرتنمانە لەژیان. من دەتوانم تەنیا ئەمە بکەم. پێویست ناکات لەمە زیاترم لێ داوا بکرێت. بەڕاستی کچەکان فیداکاری مەزن دەنوێنن. گرێدانی وا نیشان دەدەن کە باوەڕ

ناکرێت. هەروەها مەزنترین فیداکاری لەکچانەوە سەرهەڵدەدەن. بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر سەلماندیان کە چۆن خۆیان لەپێناو ئێمەدا دەسوتێنن! سەرەڕای ئەم هەموو شتانەش دیسان بەش ناکات و بەس نییە, پەیوەستبوونتان بەمنەوە, منیش دەخاتە نێو زۆری و زەحمەتیەوە. لێرەدا دەبێ چی بکەم؟ ئەوەی لەتوانامدایە بیکەم ئەوەیە کە, بەشێوازێکی زیاتر ژن بەهێز بکەم. بەهێزکردنی ژن ئەوەیە کە لەلایەك چەك بدەیتە دەستی و لەلایەك سوپای بۆ دابمەزرێنی, لەلایەك رێکخراوی تایبەت و ئایدیۆلۆژیای بۆ پێشبخەیت و تەواوی ئەمانە دیسان بەس نییە و بگرە هێشتاش دەڵێم" کە پێویستە لایەنی کەموکوڕی و فیسیۆلۆژیان پێشبخەین. ئەمەش بەس نییە, دیسان دەڵێم, دەبێ پیاو چۆن بێ و چۆن پێشبخرێت؟ ئەمەش بەواتای دووەمین کۆسپ و بەڵا دێت کە رووبەڕوومان دەبێتەوە.

بەڵگەنەویستە کە ئەمانەش بەواتای شەڕ دێن. ئەمەیە رووداوی ئەو ئەشقەی کە باسی لێوە دەکەم. جگە لەمە ناتوانرێت مرۆڤی کورد بخوڵقێنرێ. کورد بەشێوەیەکی جیاوازتر, لانەوازە. چونکە ئەوەی کە ئاغا ــ بەگە, نۆکەرن. وەکو دەبینن ماشەی دەستن, ئەوانەشی کە بیرۆکراتێکی باشن, هەموو شتێك لەپێناوی "5"فلسدا دەفرۆشن. ئەوانەی کە دەشمێنن, مرۆڤی وەکو ئێمەن. لەئێمە مانانیش هەر تەنیا ئەوەندە چاوەڕوان دەکرێ. وەك بینرا لەم رۆژانەدا لەئەستەمبوڵ ژنان دەستیان بەڕێپێوان کرد بەڵام لەلایەن پۆلیسەوە بڵاوەیان پێکرا, چونکە پۆلیس دوژمنی خۆی باش دەناسێت و ئەو هێرشانەشی کە کرایە سەریان پێویستە مانایەکی گرنگی بدەینێ. چونکە پۆلیس ئەو ژنانەی کە بۆنی ئازادییان لێدێت, باش دەناسی. بۆیە هەوڵیاندا پەرتەوازەیان بکەن. ئێمەش باش دەزانین کە هێرش دەکەنە سەر بوێرییان. وەلێ ئەوانە لەلای ئێمە شتێکی ئەوتۆ نین. بۆ ئێمە ئەشکەنجە رۆڵێکی ئەوتۆی نییە و کاریگەری ناکات. لەڕاستیدا خودی ئەشقیش لەخۆیدا بەواتای مەزنترین ئێش و ئازار دێت. وەلێ ئەگەرچی ئەمە بۆ ئێمە زۆر زەحمەت بێت, وەلێ دۆزینەوەی ئەشق پێویستییەکە. بەبۆنەی ئەم رۆژە زۆر بەنرخەوە, ئەو خەڵاتە بەنرخەی کە بیکەمە دیاری بۆ ئەو ژنانەی کە هەمیشە لەنێو ئێش و ئازاردا دەتلێتەوە و دەخنکێن, هیوای ژیانێکی مەزنە, بۆ ئەوەی هێزی ئەو ئازادییەی کە لەمێژوودا ونیان کردوە بەدەستبهێنن, دەرگای ژیانێك دەکەمەوە. بۆ بەدەست هێنانی ئەمەش هیچ پێویست ناکات پەلە بکرێت. ئێوە هەروەکو چۆن ژیانی خۆتان دەبەخشن و مردن دەخەنە بەرچاوی خۆتان, ئاوەهاش پێویست دەکات هێزی بەرخۆدان لەپێناو بەرهەمی ژیانێکدا کە ئازادی فەراهەم دەکات نیشان بدەن. ئێمە کاتێك باس لەهێزی بەرخۆدان دەکەین, من ناڵێم هەموو رۆژێك بکەونە نێو شەڕ لەگەڵ پیاودا, بەڵکو ئەوەی من دەیڵێم, زمانی تایبەتی خۆی هەیە. زمانی هونەر, زمانی رێکخستن, زمانی سەرنج راکێشان هەیە, بۆ رێکخستنی گەندەڵییەکانیش زمانێك هەیە. زمانی ئافراندنی جوانی ژن و ژنێتی هەیە, ئەگەر ژنێك لەهەموو رووییەکەوە خۆی رێکبخات و جوان و بەپیلان بێت, ئەوا باوەڕ دەکەم کە دەتوانێ هەموو پیاوێك بخاتە سەر هێڵی راست و بیگۆڕێ. بەدڵنیاییەوە ئەمەش چەکێکی هەرە مەزنە و ئێمە دەخوازین تێکڕای ئەمانە لەچوارچێوەی YAJK دا پێشبخەین. ئێستا هێزی YAJK خۆی لە (250) ئەندام بەگشتی دەدات, هەربۆیە پێویستە لەسەرەتادا پیاوانی نێو PKK بەتایبەتی و تەواوی پیاوانی کۆمەڵگاش بەگشتی بخەنە سەر رێگای راست و بیانگۆڕن. من زۆر باوەڕ بەمکارە دەکەم, من زۆر

باوەڕیم بەژن هەیە هەربۆیە ئەمانە پێش دەخەم. ئەمڕۆ ژنانی گەریلا لەچیا سەرکەشەکاندان, ئەو ژنە گەریلایانەی کە زۆرمان خۆشدەوێن لەسەر چیان و گەلێك لەوانەش وەکو " زیلان "ەکان بەرەو پیری شەهید بوون چوون. ئەوان ژنانی ئێمەن, وەلێ بەڕاستی ژنانی قارەمانن و ئێمە لەگەڵ ژناندا ژیان بەسەر دەبەین. لەگەڵ کەسێکی دیکە ناژین. ئێمە پیاوی ئەو ژنانەین.

بەبۆنەی ئەم ڕۆژەوە زۆر بەڕاشکاوی لەدیاریکردنی ئەمە, هەست بەغرور دەکەم, بەڕاستی بوون بەپیاوی ژنێك نا, بەڵکو بوون بەپیاوی ژنانی وەها غرورم پێ دەبەخشێ.

ژنان و دایکانمان بەمجۆە پەسندمان دەکەن. ئەمە بۆ ئێمە زۆر سەربەرزی و بەهادارە. خۆزگە گەلێك پیاوی دیکەش وەکو ئێمە بەمجۆرە بوونایە. ئەگەر بەم شێوەیە بوونایە, ئەوا بەڕاستی ئەم ڕۆژە یاخود تەواوی ژیان دەبووە موڵکی ژنان, هەربۆیە تادوایی پێویستیمان بەمە هەیە. لەبەرئەوەی من دەرك بەدڵی دایکان دەکەم و, دەزانم چی دەخوازن. دەزانم ئومێد و ئەشق و کچەکانمان چین و چییان دەوێ. لەبەر ئەوەی من دەرك بەو ڕاستییانە دەکەم, توانیومە بگەم بەم ئاستەی ئێستام.

کاتێ باس لە"جوڵانەوەی دڵێکی مەزن" دەکەین, بەدڵنیاییەوە پێویست دەکات ئەم ڕاستیانە ببینین. دەبێ پیاوەکانمان تاڕادەیەك لەمە تێبگەن. واتە کاتێك هەندێ هێز و دەسەڵاتی کەوتە دەست, بەبانگێشەی ئەوەی کە گوایە " ژن لاوازە ", نابێ هەست و سۆز و تەنانەت جەستەی جوانیان, بشێوێنن و خراپی بکەن. پێویستە هەندێك واتا ببەخشینە ئەم ڕاستییە و بگرە دەبێ پێشیان بخەین و بەبچووکیان دانەنێین. ڕاست نییە بڵێین:"لەسەدا سەد ژن موڵکی منە, کەی دڵم بخوازێت لێ دەدەم و سوکایەتی پێدەکەم و قسەی ناشیرینی پێ بڵێم " کاری هەرەباش کە دەبێت جێبەجێی بکەین, ئەگەر ژنەکەی خۆشت بێت, ئەوەیە کە داخوا چەندە هەوڵی پێشخستنی دەدەیت. من هەمیشە ئاماژە بەم ڕاستینەیە دەکەم کە: " کاری من ئەوە نییە کە ژنی ناوماڵ زێدە بن, بەڵکو ئەوەی من لەپێناویدا کۆشش دەکەم, پێشخستنی ژنی ئازادە". لەڕاستیدا پێشخستنی ژنی ئازاد لەلای من وەکو " پەرستن" وایە. هەندێك کەس ڕەخنە لەحەزرەتی "موحەمەد" دەگرن, وەلێ لام وایە وردەکاری و هەستیاریەکی یەکجار مەزن لەلای حەزرەتی موحەمەد هەیە. وەکو دەزانرێت حەزرەتی موحەمەد ژنی زۆر هێناوە کە 13 کەنیزەشی هەبووە. ناکرێت تەنگ لەم مەسەلەیە نزیك ببینەوە. حەزرەتی موحەمەد لەلایەن حەزکردنی بۆ ژن, کە لەو سەردەمەدا بەچاوی بچوك بینین و بەسوکایەتی سەیری ژن دەکرا و کچ بەمنداڵی زیندە بەچاڵ دەکرا ــ زۆر پێشکەوتوو بوو. ڕەنگە ئامانجی سیاسیشی هەبووبێت, سەرەڕای ئەوەش ئاشکرایە کە بەها و نرخی زۆر دەبەخشیە ژنەکانی خۆی. هەربۆیە دەخوازم ئاماژە بەوە بکەم کە ئەو تاوانانەی کە دەخرێتە پاڵ حەزرەتی " موحەمەد" دەرهەق بەنزیك بوونی بۆ ژن, من لەجێگای خۆیان نابینم و بەڕاستیشیان لەقەڵەم نادەم".

لەقۆناخەکانی دواتردا مەسەلەی " حەرەم" پێشخران. عەباسیەکان, ئەمەویەکان و عوسمانیەکانیش بەشێوەیەکی زۆر قرێژ و گڵاو دیاردەی "حەرەمیان" دامەزراندوە. لەلای ئێمەدا تەواوی کچەکانمان, وەکو دەشبینرێت, جەنگاوەری زۆر مەزنن. واتە هەرگیز پەسند ناکەم کە پیاو دەستیان لێبدەن. واتە ئەو کچانە

ئەوانەن کە زۆرداری و چەپەڵی و ئەوانەی خولیای ئازاد بوونیان نیە, پەسند ناکەن. ئەمەیە راستینەی رەوشت لەنێو PKK دا.

ئەم راستیە بەرەو کوێمان دەبات؟

بەدڵنیاییەوە ئەم راستینەیە ئێمە بەرەو ژیانێکی نوێ دەبات. ئەمە ئێمە بەرەو دەزگایەکی نوێی خێزان دەبات کە پشت ئەستوورە بەئازادی و یەکسانی, دەمانبات بەرەو شێوازی پەیوەندیەکی نوێ و بەرەو چەمکی جیهانێکی هاوبەش. من تەنیا ناڵێم ئەمە بەرەو دەزگایەکی نوێی خێزانمان دەبات, بەڵکو بەرەو پێکهاتەیەکی نوێی کۆمەلآیەتیمان دەبات. هەربۆیە ئەمە زۆر پێویستە و پرۆژەی ژیانە.

"ئەگەر ژنان بەهێز نەبن ژیان رزگار نابێت"

بەبۆنەی ئەم رۆژەوە, ئێمە ناڵێین:" ئازارمان کێشا, ئەمرۆشمان لەژنان پیرۆز کرد." نەخێر چاوەکان بەزەقی دەکەینەوە و, هەرتەنیا قسە کردنیش بەش ناکات. ئەمە ئەم رۆژەیە کە دەبێ پرۆژەی بۆ دابرێژین و یۆتۆپیای ژیانمان پێشبخەین و ئەشقمان پەرە پێبدەین. وەلێ بۆ ئەوەی جارێکی دی لەبیر نەکرێت, دەبێ بەشێوەیەکی راستەقینە هەڵوەستەی لەسەر بکرێت. ئێستا کچەکانمان تاڕادەیەك بەمجۆرەن. خۆی لەخۆیدا ئێمەش تاڕادەیەك لەسەر ئەم بنەمایە دەژین. هەر پیاوێك بەجۆرێك دەژی, منیش تاڕادەیەك بەمجۆرە دەژیم. لێرەدا پیاو قسە لەسەر ئەمە دەکات و دەڵێت:" بازنێکم هەبێت کە 100٪ هی من بێت, مەگەر ئەوکاتە بتوانم ژیان لەگەڵیا بەسەربەرم "منیش دەڵێم:" ئەگەر سوپای ژنی ئازادم نەبێت ناتوانم بژیم". بێگومان ئەمە خولیا و ئەشقێکی مەزنە. واتە سوپایەك کە تێدا ژنی بەهێز, قارەمان, رێکخراو, جوان و خاوەن زمان و ئیرادە و شەڕ بێت. بەمەزەندەی من قارەمانێتی مەگەر لەنێو نزیك بوونێکی بەمجۆرە بخولقێ. نزیك بوونی وەك " با ژن 100٪ هی من بێت, مولکی من بێت و لێیدەدەم و سوکایەتی پێبکەم و جوێنی پێ بدەم" خۆی لەخۆیدا بێ ئەخلاقیەکی مەزنە و لەڕووی مافی مرۆڤیشەوە مەزنترین ناهەقیە. بۆچی تا ئەو رادەیە هی تۆ دەبێت و بۆچی تۆ نابیت بەهی ئەو؟ بۆچی 100٪ ئەو هی تۆیە, وەلێ لەسەدایەك چییە تۆ نابیت بەهی ئەو؟ زمانیت بڕیوە, ئیرادەیت تێکشکاندووە لەڕووی ئابووریەوە بەتۆوە گرێدراوە. لێرەدا زۆرداریەك هەیە و دیکتاتۆریەتێکی ملهوڕانە لەئارادایە.

من چی لەم پیاوانە بکەم؟ ئەو پیاوانەی زۆر ستەم کار و نایەکسان بێ رێز و حورمەتن. پێم وایە ئەگەر ئەم شتە لەژنەکانمان بخوازین, نزیکبوونێکی باش دەبێت. پێویستە رشتیش بێن لەسەر ئەم هەڵوێستە. بێگومان ناکرێت بەشێوەیەکی دیکە ژن بەهێز بکرێت.

هەربۆیە ئەگەر ژنان بەهێز نەبن, ژیان رزگار نابێت. هەمیشە باس لەمە دەکرێ" من خاوەنی ئەمجۆرە هەست و سۆزەم" بەڵێ ئەمە پێویست دەکات, وەلێ لەمە بەولاوە نازانرێ لەبەرامبەر کێ و بە چ هەست و سۆزێك و لەگەڵ کێ دابەشی بکات, ئێوە توانای پێشبینی کردنتان نییە, تەنانەت منیش پێویستە بەئاشکرا باس لە راستینەی پیاوێتیمان بکەین, پیاوان بەوجۆرە نین کە مەزندە دەکرێ. ئەمە بەچییەوە دەبێت؟ بۆ ئەمە گفتوگۆکردن پێویستە, پێویستیش دەکات بەزمانی خۆتان بدوێن و ئیرادەتان بەهێز بکەن و ئایدیۆلۆژیای خۆتان بونیاد بنێن. ئەمە مافی ئێوەیە. ئایدیۆلۆژیای ژن لەکۆمۆنەی سەرەتایدا باڵادەست و

بەهێز بوو. لەڕاستیدا پشت بە بەرهەم دەبەستێت. پێویستە ئێستاش تاقی بکرێتەوە. هەندێك دەڵێن:" ئەگەر ژن بەهێز ببێت زۆر مەترسیدار دەبێت" نەخێر, پێویستە مرۆڤ لەژنی بەهێز نەترسێت, بەڵکودەبێت لەژنی لاواز بترسێت. ئێمەش پێمان وایە کە ژنی نەخۆش لەئارادایە. هەروەکو لەسەرەوە باسمان کرد کە ژنانی نەفام و لاواز, مەترسیداترین ژنانن و بەداخەوە لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا دەبێ لەبەرامبەر ژنی بەمجۆرە شەڕی دژوار بکرێت. ژنان بەشێوەیەکی بابەتییانە نوێنەرایەتی سیستەمی دوژمن دەکەن. بێگومان ئەگەر وشیار نەبنەوە و خۆیان رێکنەخەن و تێنەکۆشن, ئەمە دەبێتە گەورەترین مەترسی. بەبۆنەی ئەم رۆژەوە دەتوانم بڵێم کە تەواوی ژنان پێویستیان بەئیرادەیەکی دیاری کراو و تێکۆشانێکی هەڵبژاردە هەیە. بەپێچەوانەی ئەمەش لەدوژمن مەترسیدارتر دەبن. هەرلەبەر ئەمەشە کە من بەشێوازێکی ئایدیۆلۆژی — فەلسەفی هەڵوەستە لەسەر کێشەی ژن دەکەم.

باشە ئەگەر ئەم ئایدیۆلۆژیایە پێك بێت, چۆن دەبێت؟

ئەگەر کوردستان جێگەی باس بێت, یان ئەگەر بڵێین لەسەر ئەم خاکەدا ژیان چەندە خۆش و جوانە, ئەوا پێش هەموو شتێك ئایدیۆلۆژیای ژن بێ خاك نابێت. تەنانەت دەستپێکردنی بەکێڵانی زەوی و بەرهەم هێنان تاڕادەیەکی زۆر گرێدراوە بە هونەری ژنەوە. کەواتە پرەنسیپی یەکەمی ئایدیۆلۆژیای ژن, ژیان بەسەربردنە لەسەر ئەو خاکەی کە تێیدا لەدایك بووە, واتە وڵاتپارێزییە. تایبەتمەندی دووەمیش, ئەگەر ژن لەنێو ژیاندا جێگە بگرێت, ئەوە تەنیا بەقسەکردن نابێت, بەڵکو پێویستە بەهزری ئازاد, بە ئیرادەی ئازادەوە خۆی تەڤلی ژیان بکات.

ئەگەر ئەم ئایدیۆلۆژیا پێکبهێنرێت, ئەوا گوزارشتی هەرە بەرجەستەی ژنان, هەروەکو چۆن دەیانەوێت بژین, هەر بەم شێوەیەش دەگەن بەئاستی بڕیاردان. ئەوکاتە باوەڕی بەبیر و بڕوای دەهێنن و رێز لەئیرادەی دەگرن. ئەمە یەکێك لەو پرەنسیپانەیە کە ناتوانرێت دەستبەرداری لێبکرێت. پێویستە ئەمە بڵێیت:" من لەسەر ئەم بنەمایە دەتوانم لەگەڵ تۆدا ژیان بەسەربەرم. ئەمەش بەئیرادە و ئازادی هزرمەوە گرێدراوە "بەمجۆرە قسانە کە بگوترێت " من ژن دەخەڵەتێنم, یاخود بگوترێت ئەو بەژنێتی من فریو دەدرێت یاخود بەزایندی هەرزانی من فریو دەدرێت". لەنێو ئەم پرەنسیپانەدا شتێکی بەمجۆرە نییە. سێهەم پرەنسیپ بێگومان بۆ ئەوەی ئەمە ئەنجام بدرێت و لەپێناو ژیانێکی هاوبەش کە پشت ئەستوور بێت بەئازادی رێکخستن پێویست دەکات. مرۆڤی بێ رێکخستن هیچ نییە. یەکەم رێکخستن لەژنەوە دەستی پێکردووە. هەربۆیە پێویستە ئەو هێزەی کەوا رێکخستن بەبنەما بگرێت, هێزی ژنە. لەوانەیە پیاو بێ رێکخستن بێت, یاخود لەخۆیدا رێکخستنی پیاوان زۆرن, بۆیە پێویستە ژنان رێکخراوەیکی تایبەت بەخۆیان دابمەزرێنن. پێویستە هەست و بیر و بڕواکانی خۆیان لەهەموو بوارە کۆمەڵایەتییەکاندا بڵاو بکەنەوە, پێویستە ژنان خاوەن رێکخستن بن پێویستە هەموو ژیانی خۆتان هاو ئاهەنگ لەگەڵ رێکخستندا بسازێنن. چونکە لەبەر نەبوونی تێکۆشان, ناسنامەی ژنان لەنێو چوار دیواردا قەتیس کراوە, زیاتر کاری ناوماڵ وەکو قاپ شوشتن, نانکردن... هتد پێی رەوا بینراوە. واتە ژنان خۆشیان نەبوونەتە خاوەنی ئەو داخوازیەی کە بەتەواوەتی ئەم رەوشە رەتبکەنەوە. هەربۆیە پێویستە لەسەرەتادا لەسەر بنەمایەکی ئایدیۆلۆژیی, سیاسی, رێکخستنی,

کولتووری و هەروەها لەهەر بوارێکدا کە بتوانێت خۆی بەهێز بکات, پێویستی بەتێکۆشانێك هەیە, ئەمەش بەو مانایە نایەت کە خۆیی خەریکی منداڵ بەخێو کردن بکات و هەموو تەمەنی خۆی بەکاروباری ناوماڵەوە بەسەر بەرێت, بەڵکو پێویست دەکات بڵێ:" من دەبمە بەردی بناخەی ڕێکخستن" و هەموو کاتی خۆم بۆ تێکۆشان تەرخان دەکەم".

هەروەها پێویستە ئەمەشی بخەینە سەر: پێم وایە ژیان بەسەربردن لەگەڵ ژن دا پەیوەندی بەجوانی و ئەستاتیکەوە هەیە. لەبەرئەوەی لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا ئاستی گەندەڵ بوونی ژیان بەربڵاوە, هەروەها لەبەرئەوەی پەیوەندیەکی زۆر پتەوی بەچەوساندنەوەوە هەیە, هەربۆیە ئەو ژنەی کە داخوازی ژیان بکات, پێویستە کە لایەنی هونەری, کولتووری, ئەستاتیکایی, بەبنەما وەربگرێت. پێویستە لەجوانی فیزیۆلۆژیاییەوە (جەستەییەوە) بگرە تاوەکو بیر و بڕوای, لەشێوازی دواندنەوە بگرە تاکو ڕۆحی ڕووناکی, بەئەستاتیکا ـ پرەنسیپەوە. گرێدراو بێت.

ئەگەر بێتو ئەم پێنج پرەنسیپە کە دەکرێ زیاتریش ڕوونبکرێنەوە و بەشێوەی ماددەیەك گەڵاڵە بکرێ و, ژیانێك لەسەر بنەمای ئەم پرەنسیپانە بۆ خۆتان فەراهەم بکەن, ئەوا پێم وایە کە گەورەترین چەکی رزگاریتان بەدەستکەوتووە. بەهۆی ئەم چەکانە بەبۆنەی ئەمڕۆژەوە ئاماژە بەمە دەکەم ـ لەتواناتاندایە چۆك بەهەموو پیاوێك و دەزگایەك دابدەن, لام وایە بەنرخترین ژیانیش ئەمەیە. ئەگەر ڕێزی ئەمڕۆژە بگیرێت, ئەوا لەسەربنەمای ئەم پرەنسیپانە ـ لەلای ئێمە YAJK ئەمە بەرجەستە دەکات ـ ڕێکخستنێکی ژنان و خەبات کردن لەسەر بنەمای ئەم پرەنسیپانە, ئەوا ئەو کاتە دەتوانێت گەورەترین وەڵام بۆ مرۆڤایەتی لەبەرامبەر شەڕی قرێژ, لەبەرامبەر ژیانی ئازاد, بداتەوە.

بەبۆنەی ئەم ڕۆژەوە بەهەموو توانایەکمەوە لەخزمەت ژنانی ئازاددا دەبم و هەروەها لەسەریدا بۆ دایکان, بەتایبەت بۆ تەواوی ئەو ژنە قارەمانانەی کە لەگۆڕەپانی شەڕدان و بۆ تەواوی ئەو ژنانەی لەنێو خەباتەکەماندا جێگەیان گرتووە هەڤاڵێتی خۆم دیاری دەکەم.

**8ی مارتی 1998**

تاوەکو ئێستاکە راستینەی لێگەڕین بەدوای ژیان لەکەسایەتی خۆمدا بەبەردەوامی درێژەی هەیە, ئاستی ئەمریش بەشێوەیەکی زۆر بەرچاو لەژیاندا دیارە. کاتێك لەهەوڵ و تێکۆشانی ئەوەداین ژیان بەدەست بێنین و بگەین بەئاستی ژیانێکی شایستە و شانبەشانی ئەمەش شەڕێکی مەزن سەبارەت بەچۆنیەتی ژیان لەگەڵ ژندا پیادە دەکەین, لەهەمانکاتدا سەبارەت بەم مەسەلانە درێژە بەلێگەڕین دەدەین. پێویستە زۆر بەباشی لەم راستییانە تێبگەین. هەر لەمنداڵییەوە کاتێ ئەم رەوشەم بینی پەسندم نەکرد و ناڕازیبوونی خۆم نیشاندا. دەتوانم ئەوەش دیاری بکەم کە بەیەکگەیشتنی ژن و پیاو تاڕادەی خنکاندن, منی تەنگەتاو و پەست دەکرد. هەر لەوکاتەدا ئەم راستینەیەم بینیبوو کە پێویستە ژیان بەمجۆرە نەبێت, هەر لەم رۆژەوە تاکو ئەمڕۆ وەك تاکێکی ئازاد پێویستی ئەوەم بینی کە بەتایبەتیش بەرامبەر بەڕاستینەی ژن خۆم رێکبخەم و ئەمەش رەنگدانەوەی خۆی بەسەر ئاستی تێگەیشتن و هەست و کەسایەتیم دا کردووە. بەپوختی دەتوانم بڵێم:" شێوە گرتنێکە لەسەر بنەمای هەستیاری و وریایی و نەکەوتنە نێو هەڵە و بەبنەماگرتنی سەرکەوتن و رێنەدان بەشکست. بەڵێ دەتوانم باس لە شێوەگرتنی کەسایەتی و شێوازێکی بەمجۆرە بکەم. هەروەها پێویستە ئاماژە بەوەشەوە بکەم پێویستی ژیان لەگەڵ ژنەوە پێشکەوت شتێکی زۆر زەحمەت و ئاستەم بوو. گرنگترین لایەن کە پێویستە ببینرێت ئەوەیە کە کارێکی سادە و ئاسایی نەبوو, توانیمان ئەو راستینەیە ببینین کە لەئەنجامی خواستنی ژن بەگوێرەی پێوانە باو و کلاسیکییەکان ژیان بەدینایەت و لەڕاستینەی کۆمەڵگای ئێمەدا وون بوون و دۆڕانێکی مەزن لەگەڵ خۆیدا دێنێ. هەربۆیە خواستنی ژن بەگوێرەی ئەم داب و نەریتانە لەلای من وەکو تاوانێکی مەزن و لەدەستدان و دۆڕاندنی ژیان دەهات. دەبێت دان بەوەشدا بنێم کە لەم لایەنەوە بەدوودڵی و ترسێکی مەزنەوە هەڵوەستەم دەکرد و نزیك دەبوومەوە, سەرەڕای ئەمەش لێگەڕین درێژەی هەبوو. لەکاتێکدا کە کێشەکە قاڵدەبۆوە و پێویستی دەکرد هەڵوەستەی سەبارەت بکەین بیرم لەوە دەکردەوە بەردەوام بەدوایدا بچم و لێی بکۆڵمەوە.

هێشتا تەمەنم حەوت ساڵان بوو, لەگوندەکەماندا کچانی پێگەیشتوو هەبوون, هەر رۆژە و یەکێکیان بەبووکی دەبرد, هەر لەم رۆژەوە رقم لەم مەسەلە هەستا و گوتم پێویستە بەمجۆرە نەبێ.

بەڵام ئەمە مەسەلەی هێزە ئەوەی بەهێزە و پارەی هەیە کچ دەبات, پیاویش دەبات, هەرشتێك بخوازێ دەیبات. هەر لەوکاتەوە من خاڵێکم بۆ ژیانێکی بەمجۆرە داناوە. هەربۆیە لەڕێگای ئەم هەنگاوەمەوە شەڕێکم دەستپێکرد. من پێشتر باسی ئەوەم بۆ کردبوون کە سەرەڕای ئەوەی کە داب و نەریتە باوەکان رێگربوون, من هەر لەمنداڵی یەوە بانگی کیژۆڵانم دەکرد تاوەکو بەیەکەوە یاری بکەین, کاتێ ئەم کچانەیان بەبووکی دەبرد چۆن چوومە لایان و پێم گوتن: وەرن با درێژە بەیارییەکانی منداڵی بدەین. لەلایەك ئەمە هەیە, لەلایەکی تریشەوە لەدوا قۆناخی زانکۆدا بووم تەنانەت وشەیەك چییە لەگەڵ کچانی زانکۆ نەمدرکاند.

بێگومان شتێکی زەحمەتە و تا دواڕادە پەیوەندییەکی فەرمی ( رەسمی ) یە. ئێستاکەش ئەو کیژۆڵانەم لەبیرە کە لەزانکۆ و قۆناخی ناوەندی و لەلادێش لەگەڵمدا بوون. بەڵام باوەڕدەکەن هێزی ئەوەم نیشان نەدا کە بەکچێك بڵێم:" تۆم خۆش دەوێ " یاخود دوو دێڕ نووسینی بۆ بنووسم چونکە بەشتێکی نابەجێم دەبینی. کاتێك کات و قۆناخیشی هات سوپایەکی ژنانم پێکهێنا. تەواوی ئەمانەش واتادارن و گرێدراوی یەکترن. هەروەکو بڵێی هەستەکانم منیان پەرێشان دەکرد. بۆ نموونە: ئەماژەم پێکرد لەزانکۆدا تەنیا یەك وشەم نەدرکاند, چونکە غرورم رێگای پێنەدام و بەکارێکی شیاو و گونجاوم نەبینی. بەڵێ هیچ قسەیەکم نەکرد و کەسیش نەیزانی چیم خۆش دەوێت, بە چ جۆرێك خۆشم دەوێت, شانبەشانی ئەمە بەو ئەنجامە گەیشتم کە گوتم: تێگەیشتنی وڵات و مرۆڤایەتی و گیانێکی مەزن بۆ خۆشەویستی پێویستە و دوای ئەمەش پارتیم گەیاندە ئاست و رۆژی ئەمڕۆمان. واتە ئەم راستییەم بینی کە تا پۆلی دوایی قۆناخی زانکۆ بۆ خۆشەویستی کراوەنەبووم و داخراوبووم, هەروەکو بڵێی زنجیرکرابووم. کاتێ هەوڵی ئەوەمدا ئەم زنجیرە بپچڕێنم بینیم کە خۆم پارچە پارچە دەبم.

هەر بۆ ئەوەی بەرامبەر بەژن نەڕووخێم و هەڵنەوەشێمەوە یاخود گیانی خۆم لەدەستنەدەم یەکێك لەشەڕە هەرە مەزنەکانم پەیڕەوکرد, تێکنەشکانیشم لەم شەڕەدا هۆی سەرەکی ئەم سەرکەوتنە مەزنەیە کە لەژیاندا بەدەستم هێناوە. دەتوانن ئەمانەش وەك ئەم شەڕانە لەقەڵەم بدەن کە گرێدراوی ئەشقە.

دەتوانن تەواوی کار و خەباتی رابردوو وەکو زەمینەیەك هەڵسەنگێنن و گرێدانیان بەلایەنی سیاسی و رێکخستنی یەوە روون دەکەمەوە. هەوڵ و تەقەلاکانی لەمجۆرە سەبارەت بەقۆناخە رابردووەکانی چۆنێتی پێگەیشتنی خۆم دیاری دەکەم و لەئەنجامیشدا هەرکاتێك شیمانەی ئەوەم هەیە لەگەڵ زەویدا تەخت بم و ببم بەیەك.

بێگومان بەهۆی هەڵوێستی زانستییانەمان بێت یاخود لەبەر ئەوەی شکستمان پەسند نەکرد, هەوڵماندا رێگایەکی ڤەبوون و ئەنجامدانی قەڵەمبازێك بکەینەوە بەرامبەر بەتەواوی ئەو کۆت و بەندانەی دوژمنان لەپێش ئەشقیان دروست کردووە شالاوێکی تۆڵەسەندنەوەمان بەرپاکرد. والێکدەدەنەوە کە لەخۆڕا و بێ هەوڵ و کۆشش پێگەیشتین؟ پێویستە بەڕادەیەکی کەمیش بێت لەشێوازی سەرۆکایەتی تێبگەن کە چۆن بۆ بەلاوەنانی کۆت و بەندەکانی پێش ژنان و ئەو هەڕەشە و مەترسییانەی پیاو دەیسەپێنێ شەڕ و تێکۆشان دەکات. ئەوەی خواستم ئەنجامی بدەم" بۆ ئەوە نییە کە بۆ ماوەیەکی درێژ بژیم بەڵکو بۆ پێشخستنی خۆشەویستییە. " ئەحمەدی خانی " سەبارەت بەم مەسەلەیە نووسیویەتی, من تەنیا بەنووسین ناوەستم, بەڵکو لەرێگای شەڕ و تێکۆشان دەخوازم رێگای لەپێش بکەمەوە. من تایبەتمەندی بەمجۆرەم هەیە کە ئەگەر شتێك لەهزرمدا جێگیر بوو دەزانم چۆن بەشێوەیەکی راست هێزی خۆمی لەپێناودا بەکار بێنم. هەر لەبەر ئەم هۆکارانەشە مەزن دەبم. پیاوێکم رۆژانە مەزن دەبم. ئیتر لەپۆلی دوایی قۆناخی زانکۆ لام شەرم بوو وەك یەکێك بمێنم کە زمانی داخراو بێت, هەربۆیە دەمگوت:" پێویستە قسە بکەم و لەوە تێبگەم کە پیاوم ". ئێوە دەڵێن: لەمێژە بۆمان روون بۆتەوە کە پیاوین. من دان بەوەدا دەنێم کە لەپیاوێتی خۆم دەترسام, مەراق دەکەم ئێوە پیاوێکی چۆنن, هەر لەبەرئەمەشە شیکردنەوە و هەڵسەنگاندن سەبارەت بەم مەسەلەیە

ئەنجام دەدەم, بەگوێرەی من هەر ئەو پیاوێتییە بوو هەرشتێکی لەگەڵ خۆیدا برد. لەوانەیە یەکێك لەتایبەتمەندێتییە هەرەباشەکانم ئەمەیان بێت. ئەگەر ئێوە لەجێی من بوونایە ئەوا لەیەك رۆژدا بەمردن ( کوشتن ) کۆتاییتان بەو شەڕ و ململانییە دەهێنا کە لەگەڵ ژن پەیڕەوم کرد. بۆ نموونە: من یاخود ئەو لەنێودەچووین. سەرەڕای ئەوەی توانیم لەوەدا سەربکەوم کە نەبمە پیاوێکی وەکو ئێوە, لەهەمانکاتدا هیچ ئان و ساتێك ئەوەم لەبەرچاونەگرت کە لەژن بدەم یاخود وەکو رەگەزێك بیبینم کە پێویست بێ فشاری بخرێتە سەر, هەڵوێستی راستیش ئەمە بوو. نەدەشیا و نەدەبوو فشار و باڵادەستی پێش بخەم. ئەگەر خراپەکاری بەرامبەر بەمنەوەش کردبێت, مانای ئەوەیە کە لاوازی لەمندا بووە, من خۆم دان بەوەدا دەنێم. ئەمە چییە؟ لەکاتێکدا ئامادە نەبوویت و پێوانەت نەکردبوو و نەتدەتوانی وەڵام بدەیتەوە و لەڕەوشێکی پەرێشاندا بوویت بۆچی کەوتیە نێو کارێکی بەمجۆرە؟ بۆچی خۆت خستە نێو رەوشێکی پەرێشانی بەمجۆرە؟ بەڵێ من خواستم تۆڵەی خۆم لەم ئاپۆیە بکەمەوە. ئایا دەزانن هەر ئەم ساڵانە بوو توانیم خۆم بکەم بەپۆڵا. بەڵێ لەساڵی 1987 ـ دە ساڵ بەر لەئێستا ـ گوتم:" ئایا لەم رەوشە رزگاری دەبێت یان نا " لەم چوارچێوەیەشدا لەبەهاری هەمان ساڵ شیکردنەوەیەکم سەبارەت بەمەسەلەی ژن ئەنجامدا. لەم شیکردنەوەیەدا خولقاندنی تواناکاری رزگاری لە مندا دەبینن. لەم شیکردنەوەدا ئەزموونی شەڕ و ململانێی بێوچانی دە ساڵە و ئەنجامەکانتان بۆ باس دەکەم و پێشکەشتان دەکەم کە ساڵانێکن هەنگاوی دلێرانەی تێدا هاوێشترا. ساڵانێکە کە کاروانی ئازادی کوردستان لەسەر بنەمای جێگرتنی ژنان و پیاوان رێکخرا. ئەم ساڵانە ساڵانێکن کە کاروانی هاوبەشی ژنان ــ پیاوان رێکخراو لەسەر بنەمای یەکسانی و ئاڵای هاوبەش بەرێوەچوو. ئەگەر تەماشا بکەن دەبینن ئەمە لەدوای هەوڵ و تێکۆشانێکی زۆرەوە بەدیهات.

باسی ئەو شەڕ و ململانێیەم بۆ کردن کە لەگەڵ " فاتمە " ئەنجاممدا. چیللەر و فاتمە هیچ جیاوازییەکیان نییە. بێگومان لەهەمانکاتدا ئەو هێرشە نەپساوەمان نیشاندەدان کە کردمانە سەر ئەو سەرمایەیەی کە گوزارشتی خۆی لەکەسایەتی و جەستەی ژندا بەرجەستە کردبوو. چونکە لەکەسایەتی ئەودا هەم خیانەتی نەتەوەیی و لەلایەنی چینایەتیشەوە لەبەرزترین ئاستدا سەرمایەداری و فیودالیزم و کۆیلایەتی رەگەز یەکانگیر ببوونەوە. هەر لەبەرئەوەی لەئاستێکی بەرزدا بوون, بۆیە هەم چینی زەحمەتکێش و چەوسانەوەی رەگەزی و چەوسانەوەی نەتەوەیی وەکو رکەبەرێکی پوخت لەمندا ئاوێتە بوون و, کاتێك ئەم دوولایەنەش رووبەرووی یەکتربوونەوە, ئەم رووداوە دەرکەوت و سەریهەڵدا کە دەناسرێت. دەتوانن لێی تێبگەن, چونکە ئیتر شتێکی وا ئاستەم و زەحمەت نییە.

ئەوانە ژنی بەکاریگەری چینەکانی خۆیان بوون. ئێوەش ژنە لاوازەکانی چین و توێژە تایبەتەکانی خۆتانن. بەڵام من بەمجۆرە نیم, بۆنموونە من بەتێکرایی گوزارشت لەچین و رەگەز و نەتەوەی خۆم و تەواوی مرۆڤایەتی دەکەم. ئەوەی لە فاتمەشدا کۆببووەوە تەنیا سەرمایەی رەگەزی و چینایەتی نەبوو, بەڵکو شتێکی مسۆگەرە کە ئیمپریالیزمیش لەکەسایەتی ئەودا کۆببۆوە. بێگومان بەرامبەر بەم رەوشەش خۆمان بونیادنا. هەروەکو گوتم فۆرمیل ئەوەیە کە: تاوەکو راستینەی دوژمنتان ئاشکرا نەکەن و خۆتان مەزن نەکەن بەبچووکی دەمێننەوە لەڕاستیدا بەهەرزانی خۆ تێرکردن و ژیان لەگەڵ ژن و سازشکاریکردن کارێکی

زۆر ترسناکە. نموونەی ژیانی خۆمتان بۆ دەهێنمەوە: ئەوەی منی کرد بە ئاپۆ و بەو ئاستەی گەیاندم" ئەنجامنەدانی سازشکارییەکی هەرزان و سادەیە لەگەڵ ژندا. ئەو ژنە ( فاتمە ) کە پەیوەندییەکی تایبەتی لەگەڵ مندا هەبوو. ئەو تاکە ئەنجامەی دەیخواست کە بەرامبەر بەمن بەدەستی بێنێ" باش بەبیرم دێت دەیخواست منیش بخاتە نێو ئەو تەڵەزگەیەی کە پیاوی کلاسیك تێی دەکەون. لەرێگای عیناد و بیر و هزرێکی زۆر هەستیار و ترسناك دەیخواست ئەمە ئەنجامبدات, دەیگوت من دەتوانم تەنیا لەسەعاتێکدا هەموو پیاوانی نێو PKK بێنمە چوارچێوەی ئەو خاڵەی کەمن دەیخوازم. بەڵام منیش بەعینادێکی مەزنەوە هەڵوێستم بەرامبەر بەم نزیکبوونە نیشاندا, ئەمەش شەڕێکی شێتانە بوو, لەداهاتوودا زیاتر لەم شەڕە تێدەگەن, ئەنجامی ئەم شەڕەش ئێوەن, ئەی کچان.

لەوێدا تێگەیشتم لەکەسایەتی مندا دەخوازێ کۆتایی بەکورد ( ی نەزان ) بێنێ و لەناوی ببات, هەربۆیە لەو کاتەدا بەرخۆدانێکی مەزنم نیشاندا, ئەمەش بەرخۆدانێك بوو کە بەمێشك و خەیاڵی مرۆڤدا نایێت. یەکێك لەلایەنە هەرە بەهێزەکانی من ئەوەیە. لایەنەکانی تر بەپلەی دووەم دێت. تاگەیشت بەو ئاستەی بەئاشکرا بڵێم پیاوێتی رەهامان کوشتووە. هەر بەهۆی ئەم پەیوەندییە تایبەتیەش ئەمە وەك بیر و بۆچونێکی روون و ئاشکرا و پەسندکرا. هەروەها تەنیا بەوە نەوەستاین کە پیاوێتی رەها بکوژین. لەخۆم پرسی دەبێ ئەو پیاوە چۆن بێت کە ژنە ئازادەکانمان پەسندی دەکەن. ساڵانێکە شەڕێکی مەزن لەم پێناوەدا بەرێوە دەبەم, لەسەرئەم بنەمایەش هێزێکی مەزنی هزر و هەست پێشکەوت. بەهادارترین خەباتگێرانی ژن وابەستەی ئەم پێشکەوتنە بوون و بوونە نوێنەر و گوزارشتی ئەم هێزە. لەسەر ئەم بنەمایەش لەچوارچێوەی گرێدان بەنەتەوە و کۆمەڵگا و شەڕ و پێشکەوتن و بەرز و پیرۆزبوون.

بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا پێشکەوتنی هەستە بەرز و پیرۆزەکان گەیشتۆتە ئاستی نەتەوەیی و, تەنانەت ئەشقێکی نەتەوەییش پێشکەوتووە و بەشێوەیەکی زۆر سەرنج راکێش دەرکەوتۆتەڕوو. لەو باوەڕەدام کە لەڕێگای دەرخستنی جوانی جەستەیی ژنەوە تاوەکو بەدەستهێنانی هێزی چینایەتی و هزری ژن بەشێوەیەکی زۆر زەق و بەرچاو, ئەم راستییەمان نیشانی هەمووتان دا کە شەرڤانێکی مەزنی ئەم رێبازەین و چۆن بەلێهاتوویی پەیرەوی لێدەکەین.

پێویستە بەشێوەیەکی گرنگ لەسەر ئەوە بوەستین کە چۆن بەشێواز و هەڵوێستی " پرۆمیتۆس " هێزمان لەدەست پیاوی باڵادەست دەرهێنا, هەروەها ئەم راستییەش دەرکەوتووە کەپێشکەوتنێکی سادە و لەخۆڕا نییە, بەڵکو پێشکەوتنێکە سەرنجی گۆڕەپانی نێودەوڵەتیشی راکێشاوەتە سەرخۆ. پێتان دەڵێم من لەپیاوێتی دەردەکەوم, گوتنی ئەمە شەرم نییە, ئەی دایکم پێی نەگوتم: وادیارە ئەمە نابێتە پیاو! بەڵێ سەیری رەوشی ئەوکاتەی منی دەکرد و ئەو قسەی پێ دەگوتم. پیاوێتی و ژنێتی چەند فلوس دەکات. ئەوکاتە من تا ئاستێکی بەرز شەرمم دەکرد. هیچ کاتێك خۆم بەمجۆرە پیاوە دانەنا کە ئێوە لێی تێگەیشتوون. دەترسم و لام شەرمە کەوەکو ئێوە خۆم لەشوێنی پیاو دابنێم. هەربۆیە زاراوە و گوتەی لەشێوەی:" حەزمان لەژنە و پیاوێکین بەگوێرەی ژنان " رەوشێکە بەهیچ جۆرێك ناتوانم پەسندی بکەم. بەگوێرەی من پیاو بەمجۆرە نییە و نابێ. بەڵێ کچانیش دەخوازن ببن بەژن, بەگوێرەی من ژنی بەمجۆرەش

نابێ. من ناچارم ڕێز لەژیان بگرم. دەڵێن: حەزمان لێیە و نازانم چی. ناچارن باش تێبگەن کە چۆن و بۆچی حەزتان لەشتێکە. ئێوە پیاوی زۆر کۆن و کلاسیکن, ئەمەش شتێکی باش نییە و هەڵەیە. هەربۆیە پێویستە باش لەو تەگبیرانە تێبگەن کە بۆ ئەوە پەرەمپێداوە تاوەکو نەکەونە ڕەوشی پیاوێکی بەمجۆرە.

ئێمە مەیل و چالاکییەکی ئازادیمان هەیە و واقیعی کۆمەڵگایەك بەرچاودەگرین. هەروەها باش دەزانن کە تاوەکو ئێستا چۆن ئەم سیاسەتەمان گەیاندۆتە چ ئاستێك. ئامانجمان ئەوەیە پیاوی کورد و ژنی کوردی نوێ و, تەنانەت لەئاستی گەردوونیشدا مرۆڤێکی نوێ بخوڵقێنین. ئیتر پێویستە بەشێوەیەکی چڕوپڕ ئەمە هەڵسەنگێنین. نازانم پەیوەندی کێ لەگەڵ کێ هەیە و کێ لەگەڵ کێ خەوت؟ ئەمە گوزارشت لەئاستی پەیوەندی ئێمە ناکات. ئەگەر یەکێك جێگای خۆشەویستی لانەبێت چی لێبکەین؟ ئەگەر یەکێك ڕەوشێکی خراپی هەبێت, کەس ناتوانێت ڕێگامان لێبگرێت تاوەکو هەڵوەستەی سەبارەت بکەین و بەسەر ئەم ڕەوشەیدا بچین. ئێمە مرۆڤی ئازادین، سیاسەتی کۆت و بەند و بەستنەوە لەم لایەنەوە ئەنجام بەدەست ناهێنێ. هەربۆیە من لەخۆڕا باسی ئەم مەسەلەیە ناکەم.

هیچ شتێك لەوە بەهادارتر نییە کە ئەو ژنانەی لەنێو ئاستێکی شکۆمەندیدان ببنە میللیتان و خەباتگێڕانی سەرۆکایەتی.

سەرەڕای ئەو هەوڵ و تێکۆشانە مەزنەی ئەنجامی دەدەین" یەکەم: تەواو خۆشەویستی ناکەم, دووەم: بەتەواوەتی منیان خۆش ناوێت، سێیەم: لەڕەوشێکی بەمجۆرەدا نیم بتوانم پیاوێتی بکەم, چوارەم: لەوانەیە لەهەرکات و ساتێك ژنان ببنە بەڵای سەرسەرم، شەشەم: بەردەوامی بەگۆڕین و پێشخستنی کەسایەتیەکان بدە. بەڵێ گرتنە دەستی ئەم مەسەلەیە لەسەر ئەم بنەمایانە زۆر گرنگە.

جیاوازیم لەم لایەنەوە بوو: پێویستە مەسەلەکانی پارە و ژن و هێز بەشێوەیەکی زۆر جددی و هەستیاریەوە بیگیرێتە دەست. بۆچی من هەڵوێستێکی بەمجۆرەم سەبارەت بەم مەسەلانە نیشاندا؟ بەر لەهەموو شتێك مەترسییەکی مەزن لەئارادا بوو و, شیمانەی ئەوە هەبوو قووت بدرێم. هەڵبەتە ئەمەش ئاشکرا دەبێت" لەو خاڵەی کەقارەمانترین کەسایەتیمان تیێدا سەردەکەوت و تێك نەدەشکا, شیمانەی هەبوو تێك بشکێم. ئێمە تا دوارادە مرۆڤی واقیعبینین. بێگومان گرنگترین تایبەتمەندێتی شەڕڤان و فەرماندەکان واقیعبینییە. پێویستە سەربارەت بەڕاستینە سەرەکیەکانی خۆی و سەربازەکانی و مەسەلەی مەیل و هەستەکانیان واقیعبین بێت. وادەزانن لەم ڕاستییە تێناگەین لەلای من هیچ جیاوازییەك لەنێوان ژن و مێرد و کچ و پیاودا نییە, ئەمەش مانای ئەوە نییە کە من ئەشق ناخوازم و پەسندی ناکەم. تا ئاستێك پەیوەندی و مەیلم بۆ ئەشق هەیە کە ئێوە لێی تێناگەن و باوەڕ ناکەن. بەڵام لەهەمانکاتدا ڕاستییەکانیش ناخەمە پشت گوێ و لەبەرچاویان دەگرم ئەگەر بێتو ڕێز و خۆشەویستییەکیش بۆ ئەشق هەبێ گرێدراوی ئەم ڕاستیەیە. ئەگەر کەسایەتی وەکو " زیلان " دەرکەوتن دیسان گرێدراوی ئەم ڕاستییەیە. بەناوی خۆم دەڵێم" پێتان ناڵێم وەرن ببن بەکچی من, بەڵام پێویستە باس لەو زیلانانە و لەو هەڤاڵانە بکەین کە بەدوای ڕێبازی سەرۆکایەتی ڕێڕەویان گرتووە. ئەمەشیان شتی هەرە ڕاستە. لەسەر ئەم بنەمایەش خەباتگێڕ و کەسایەتی میلیتانی ژنی وا هەیە کە دەخوازن ببنە هەڤاڵی سەرۆکایەتی و, تەنانەت دەخوازن ببنە ئەشق و ئەویندارى

سەرۆکایەتی. منیش پیاوی ئەمجۆرە خەباتگێڕ و ملیتانانەم و بەبەردەوامی خەریکی گۆڕانکاری و وەرچەرخانی کەسایەتی خۆمم و بەشێوەیەکی گرنگ و هەستیار هەوڵدەدەم ئەم مەسەلەیە هەڵسەنگێنم, ئەمەش پێشکەوتنێکی زۆر جوان و گرنگە.

بەو رادەیەی کە چەندە لای من بەهادارە کەمن بوومەتە میلیتانی شۆڕشگێڕێکی بەرزکردنەوە و پیرۆزکردنی ژنان, لەهەمانکاتدا هیچ شتێك لەوە بەهادارتر نییە کە ئەو ژنانەی لەنێو ئاستێکی شکۆمەندیدان ببنە میلیتان و خەباتگێڕانی سەرۆکایەتی.

ئەم خەباتگێڕانە لەوەسیەتەکانی خۆشیان ئاماژەیان پێکردووە, بەڵێ لەزیلانەوە تاوەکو سەدان خەباتگێڕی ژن لەدوا هەناسەی خۆیان وەسیەتیان بۆ بەجێ هێشتوین. گرێدانێکی زۆر بەهادار و پیرۆز لەنێوان ئەوان و سەرۆکایەتیدا هەیە. من ناچارم ببم بەملیتان و پیاوی ئەوان. ئەوانیش هەوڵدەدەن ژنایەتی خۆیان لەکەسایەتی ئێمەدا شیبکەنەوە و بەئازادی بگەن. ئیتر گرتنە دەست و هەڵسەنگاندنی رەوشێکی بەمجۆرە زەحمەت نییە و گوزارشت لەبەرزبوونەوەیەکی مەزن دەکات.

لەڕاستیدا من بەردەوام خۆم لەژنان دوور دەخستەوە و رام دەکرد, لەم لایەنەوە لەهەموو کەسێك لەپێشتر بووم. وەکو دیارە کاتێ هەولی راکردنم دەدا دەستگیرکرام. هیچ پیاوێك تا ئەو رادەیە لەگەڵ ژنان بەیەك ناگات. بێگومان پێشتر بەردەوام رام دەکرد. ئەمە چۆن بوو؟ بۆچی؟ لەڕاستیدا لەسەرەتادا, پێشبینییەکی بەمجۆرەشم نەبوو, بەڵام نازانم چۆن بەم شێوەیە روویدا. هەر وەکو تۆپی بەفرین بەدوای یەکێك بکەویت و پەیوەندی نیشان بدەیت, بەمجۆرە سات بەسات گەورە بوو تاکو گەیشتە ئەم رەوشە. بەڵێ هەڵوێست و نزیکبوونی ساتەوەختی شتێکی مەزنە. ساتەوەختی و بەردەوامی شتێکی سەرسوورهێنەرە و لەڕێگای ئەمانەوە روویدا. ئەگەر کارێك بەبانگهێشتە و بەرێك و پێکی پێشکەوت, ئەوا تاوەکو دوایی بەدوایدا دەچم. بەشێوەیەکی زۆر واتادار دەستی پێکرد و تاوەکو گەیشتمە ئێوە. لەڕاستیدا خێزانی ئێمە, ژنان و پیاوانیش زۆر بێچارە بوون. ئەو قسەیەی دایکمتان گوێ لێ بووە, سەبارەت بەمەسەلەی ژن بەهیچ شێوەیەك ئومێدی بەمن نەبوو دەیگوت: شتێك لەمە دەرناکەوێت. ئەمڕۆکە شتێکی زۆر سەیرە تائەو رادەیە رێگامان لەپێش جوڵانەوەی ژنان کردۆتەوە, هەڵبەتە شتێکی بەمجۆرە لەنێو کۆمەڵگای کوردەواریدا نییە کە هێندە کچی لاو لەگەڵ یەکتردا کۆبکەیتەوە, تەنانەت دەرخستنی کچێکی بێ مارەیی و بێ دۆست بۆ دەرەوە, تاوانە. ئەوەی من کردوومە ناکەوێتە نێو هیچ چوارچێوەیەك و لەڕاستیدا کەس ناتوانێ شتێکی بەمجۆرە بکات و تەنانەت بیری لێناکەنەوە.

وابزانم ئێوەش کەمێ سەرتان سووڕماوە. یاسا بەمجۆرەیە, پیاوێکی خوێن گەرمێك, کچێك چاوی لەیەکێك دەبڕێت و تا دواڕادە تەمەنی خۆی دەکاتە قوربانی, وانییە؟ ئەگەر بێتو منداڵێکیشیان هەبێت هەر بەمجۆرە دەبێت, بەڵام ئەوەی من شتێکی زۆر جیاوازە لەهی هیچ کەسێك ناچێت. لەڕاستیدا زۆر زەحمەتە هێندە دڵ بخولقێنی و لەخۆوە بگریت. مانایەکی تری ئەمەش ئەوەیە" کە رەوشێکی بەمجۆرەمان نییە کە لەنێو دڵی راستینەی کۆمەڵگادا جێگای خۆمان گرتبێت یاخود دەتوانین بڵێین کەسایەتییەکی بەمجۆرە لەئارادا نییە کە لەنێو دڵی خۆیدا جێگایەکتان بۆ بکاتەوە, ناچارم ئەم بۆشاییەش پڕ بکەمەوە. ئەگەر ئەم بۆشاییە مەزنە

نەبوایە, ئەوا تا ئەو ئاستە لەدڵ و هەناوەوە پەیوەندیم لەگەڵ پێشنەدەخستن, چونکە زۆر مەترسیدار دەبوو و نەدەشیا بەمجۆرە بێت.

ئەمەش ئەو مانایە دەبەخشێ کە لەلایەن کوردان بۆشاییەکی مەزن و داخوازی و دڵ لەئارادایە. بەناچاری پڕکردنەوەی ئەم بۆشاییە دەکەوێتە ئەستۆی من, ئەمەش ناچارییەکی زۆر دڕاندانەیە چونکە من سەبارەت بەکچان و ژنانی گەنج و بەشێوەیەکی گشتی سەبارەت بەستەم لێکراوەکان هەستیارم, لەڕاستیدا بەوە نەخەڵەتێن کە زۆر توندوتیژم, دڵی بەمجۆرە زۆر دەگمەنە کە وەکو دڵی من زوو کاری لێبکرێت و هێندە فراوان بێت, هەر ئەم هەستیارییەش منی گەیاندە ئەو ئاست و رۆژگارەی ئەمڕۆمان. تەواو پیاوانمان بەدوای خۆمان راکێشا و گریماندان, بەڵام راکێشانی هێندە کچی گەنج بۆچی؟ ئەمە تەنیا راکێشانێکی ئایدیۆلۆژی و سیاسی نییە, بەڵکو زۆر جیاوازە و زۆر سەرسووڕهێنەرە. لەڕاستینەی خۆتانەوە زۆر باش دەزانن کە ئەو پیاوەی دەڵێ: من و کەسێکی تر نا, هەموو رۆژێك بەشێوەی ( ؟؟ ) دەری دەهێنن. هەر رۆژە و داواکارییەك دەکەن, بەڵام جەسارەتی ئەوە ناکەن هیچ شتێك لەمن بخوازن, ئەمەش کەسێتییەکی سەیرە, جەسارەتی ئەوە ناکەن شتێك بخوازن. واتە کاتێك دەڵێن بەگیان و بەهەموو شتێك لەگەڵمدان یاخود لەگەڵماندان و تەنیا ناڕەزاییەکی بچووکیش نابینرێت. ئەمەش یەکێتییەکی سەرسووڕهێنەرە. واتە لەڕاستیدا تەنیا ئێوەم مەزن نەکردووە بەڵکو یەکێتییەکی لەوە پێشکەوتووتر پێکهاتووە. بیر بکەنەوە و بڵێن: ئەمە چۆن یەکێتییەکە. لەڕاستیدا هێزی هەیە. تاکە کەس وەکو هێزێکی مێژوویی وایە ئەمە چۆن بەدیهات؟ چۆن لەمەدا سەرکەوتنم بەدەست هێنا؟ ئەو کەسێتییە تا ئەو رادەیە لەم راستییانە رایدەکرد چۆن توانی یەکێتییەکی تایبەت بەخواوەندەکان پێش بخات؟ واتە لەڕێگای فەرمان پێدانەوە ئەوەمان ئەنجام نەدا, بێگومان تەواوی ئەم دەرئەنجامانە لەنێو شەڕێکی سەرسووڕهێنەردا بەدیهاتوون. پێم گوتن و دیسان بەشێوەیەکی ئاشکرا پێتان رادەگەینم" سەیر بکەن من سەرۆکی ئەم پارتەم: لەئاستی نەتەوەییشدا کاریگەریمان زیاد دەکات و ناچارن بەهێز لێمان نزیك بنەوە و لێکدانەوەی تایبەتیمان بۆ بکرێت, ئەگەر ژنێك هەبێت بەگوێرەی پێوانەکان نەبێت با دەرکەوێتە بەرامبەرم و بیبینم, ئاوا بەشێوەیەکی رەها نالێم بەسەریدا دەتەقینەوە و نازانم چی, بەڵکو دەخوازین چەمك و هێز و پەروەردە و تەنانەت ئەگەر جوانی و لایەنی سەرنج راکێشی هەبێت پێوانەی بکەین و لەسەری بوەستین با ئەویش من بۆ لای خۆی رابکێشێ, هەڵبەتە ئەگەر بەمجۆرە بێ ئەوەی بەرامبەری بۆ لای خۆی رادەکێشێ. ئەمانە پێشکەوتنی راست و رەوان و پێویستە هەرکەسێك رێزێکی مەزن لەم پێشکەوتنانە بگرێت. من لەم لایەنەدا بەتەواوەتی پیاوێتی خۆم دەست لێ بەردا. واتە بەم واتایە بێ هێزم. پیاوێتیم کوشت, ئەگەر نەمکوشتبوایە چی روویدەدا؟ یان ئەوەتە وەکو ئێوە دەتەقیمەوە یاخود خیانەتم دەکرد, دەبوومە بەڵا و سەرچاوەی گیروگرفت, ئەم رەوشەم تێپەڕکرد بەشێوەیەکی نائاسایی و سەرسووڕهێنەر توانستی خۆم بەپارتی بەخشی, ئەگەر پیاوێتیم هەبێت چی روودەدات؟ ئەگەر پارتی و نەتەوە و گەل مەزن بن, ژن مەزن بێت چی روودەدات؟ رۆژی زیندوو بوونەوە ( قیامەت ) روودەدات؟ ئەی خودایە با کەمێك پیاوێتیمان بمرێت. نالێم پیاو بەڵکو دەڵێم پیاوێتی, واتە ئەو تایەبتمەندێتیانە بمرێت کە ئێوە دەیخوازن.

ئێستا ئەم ژنەمان شیکردۆتەوە و ئاشنای راستینەی خۆیمان کردووە. گەیشتنی بەپێوانەی دروستی ژیانی تایبەت بەخۆی زۆر گرنگە. ئەمە هیچ پەیوەندییەکی بەژن و جارپەوە نییە, تەواو بەپێچەوانەوە ئەوەی بۆ مەبەستی تاکە کەسێتی خۆی یاخود بۆ گشت ژن بۆ نێو جاریەتی و مالّی گشتی و مالّی تایبەت پەلکێش بکات, بێ ناموسە. واتە ئەوانەی بەمجۆرە هەڵوەستە بکەن ناتوانن بەشێوەیەکی تر پەیوەندی لەگەلّ ژن ببەستن, ناشێ و ناتوانن لەسەر بنەمای ئازادی و یەکسانی و رێزگرتن هەڵوەستە بکەن, ئارەزووە سێکسییەکانیان بەشێوەیەکی زۆر پیس و قرێژە و لەسەر بنەمای باڵادەستییە. ئێمە لەم بوارەوە ژن بەهێز دەکەین, ئەمە بۆ من ئەرکێکی زۆر مەزنە. پێویست بکات خۆمان دەگەیەنینە تەواوی ژنانی جیهان, خەبات و تێکۆشان لەسەر ئەم بنەمایە دەگرینەدەست.

**ژنی لاواز لای من مانای راوەستانی ژیانە**

لەشێوازی سەرۆکایەتی ئێمەدا, راکردن بەرەو کاروانی مەزنی ئازادی لەئارادایە. رەگەزی ژن بەرامبەر بەسەرۆکایەتی تەنگەتاو نابێت و زمان و دڵی کراوەتەوە. خاوەن غرورە و جێگەی باوەڕییە. بێگومان لەلایەنی زمان و هزر و ئیرادەوە بەرەو بەهێز بوونێکی مەزنی دەبەین. رێگایەکی تر بۆ راکێشان و قازانجکردنی ژنان نییە. لەدەزگاکانی راگەیاندنیشدا رەنگی دایەوە, دەڵێن: ئەمانە پیاو نین, بەمجۆرە هەڵسەنگاندن دەکەن. نەخێر! بەومانایە نییە, بەڵکو دەستبەردان لەو پیاوێتییە بەدیدێنن کەسەرچاوەی هەموو جۆرە خراپییەکە. ئەمەش یەکێکە لەمەرجە سەرەکییەکانی بەیەکەوە ژیانێکی یەکسان و ئازاد لەسەر بنەمای تێگەیشتن و بەیەکەوە ژیانێکی جوان و گونجاو. لێرەدا تەنیا پیاو ئاوا ناکرێت, لەراستیدا بەرزکردنەوەیەکی بێ نموونەی ژنان جێی باسە. ژن لەڕەوشێکی زۆر جیاوازدایە و بەرخۆدان دەکات. هێزێکی جەستەیی و ئیرادە و چەمکێکی وا لەو کچە کوردە پەرێشانە دێتەئاراوە کەلەوانەیە بتوانێ کاریگەری بەسەر تەواوی جیهان بکات. بێگومان لێرەدا پێویستە ئەوە ببینن کە شۆڕش توانای چی هەیە.

من تاوەکو دوایی دەخوازم ژنان ببنە خاوەن هێزێکی مەزن و تادواڕادە پێم خۆشە. راشکاوانە پێتان رادەگەیەنم: ژنی لاواز لای من مانای وەستانی ژیانە, ئەو ژنەی مل بۆ من کەچ بکات, ئەو ژنەی لەبەر هێزەکەم پەسندم بکات, لەوخاڵەدا ژیان لەلای من دەوەستێ. باس لەراستینەی هەستەکانی خۆمتان بۆ دەکەم, با بەشێوەیەکی سادە و ئاسایی تیۆری و پراکتیکیش دەرباز نەکەین! هەڵبەتە ئەو ژنەی کە سەرەتا باسم کرد نوێنەرایەتی هێزی دەکرد, وانییە؟ لە راستیدا هێزی بەکرێگیراوی بوو. بەلام دیسان گوزارشت لەڕەوتێك دەکات. نابێ لەبەهێزی ژن بترسین, بەڵکو تەواو بەپێچەوانەوە, ترسان لەبێهێزبوونی ژن گرنگە. پاڕانەوە و گریان و ملکەچکردنی زۆر ترسناکە. ئێستا تەماشای من بکەن بەرامبەر بەژنێکی بەمجۆرە لەڕەوشێکی بەهێزدام, من نەفرەت لەمجۆرە هەڵوەستە دەکەم و, تەنانەت گوتم: ئایا لەئەنجامی ئەو هێزە سیاسیەی نوێنەرایەتی دەکەم تواناکاری ئەشقم لەدەستدا؟ ئەمەش بەو واتایەدێت: لەبەرئەوەی باوەڕیم بەوە هەیە لەمیانەی تواناکاری و تایبەتمەندییەکانی کەسایەتی خۆم, دەتوانم ببم بەیەکێك لەئەندامانی ئەشق. ئەگەر نا لەڕێگای پشتبەستن بەدەستەڕۆیی و بەرپرسیارێتی دەتوانم نەتەوەیەك و چین و رەگەزێکیش بکەم بەکۆیلە, لێرەدا ئەشق بوونی نییە, بەلام بێگومان مەسەلەیەکە گرێدانی خۆی

بەتواناکارییە ئازادەکانی تاکەکەس هەیە. ئەگەر هێزێکی بەمجۆرە بەشێوەیەکی دڕندانە بەرامبەر بەژن بەکاربێنیێ، ئەوا کۆیلەیەکی سۆپەر دەخولقێنیێ، بەڵام بەهیچ جۆرێك ئەشق ناخولقێنیێ، لەوانەیە گرێدراوی تۆ بێت و لەتاوانەکاندا لەگەڵتدا هاوبەش بێت بەڵام ئەشقتان نابێت، ئەمەش وەك بێ بەختییەك دەبینم. چونکە کاتێ هەر ژنێك دێتە لای من لەخۆم دەپرسم ئایا ئەم ژنە لەبەرهێزەکەم هاتووە؟ بەم رەوشە دڵگران دەبم و بیر لەوە دەکەمەوە کە ئەشق بۆمن زەحمەت بووە. لەڕابردوو هەرچەندە پێویستیم بە هەبوونی ژن هەبوو و سەرەڕای ئەوەی تایبەتمەندییەکانم دەبینرا نەدەهات، بەڵکو هۆکەی ئەوە بێت کە کۆیلە بوو، یاخود من ئومێدێکی بەمجۆرەم پێنەدەبەخشین. ئایا ئێستا بۆلای هێزەکەم دێن؟ ئەم رەوشە زەحمەتیم بۆ دروست دەکات. هەڵبەتە هەوڵ و تێکۆشانێکی مەزن دەدەم تاوەکو رەوش بەمجۆرە نەبێت، تاڕادەیەك ئەم رەوشەم بەلاوە نا. هەربۆیە پێویستە لەبێهێزی ژنان بترسین. تەنانەت بۆ گەیشتن بە ئاستێکی ئەشقیش پێویستی بەهێزی ژن هەیە. چونکە ژنی بێهێز خۆشەویستی ناکات، ژنی بێهێز قسە ناکات و بیر ناکاتەوە و خاوەن ئیرادە نییە و تەنانەت ژنی بێهێز جوانیش نابێت. ئەگەر نا، چی دەبێت؟ دەتخەڵەتێنیێ. ئەمەش هیچ گرێدانی بەڕەوشت نییە تەنانەت بێ رەوشتییە. بەشێوەیەکی بێهودە شەڕ و تێکۆشان بکە و دەنگ هەڵبڕە و بەڕێوەبڕۆ، ئەگەر ژن ئەم هەڵوێستە نیشان نەدات دەدۆڕێنیێ. لەرێگای بینینی سەرۆکایەتی وەك باوکی گشتی هەمووان یان بەشێوەیەکی تر هیچ کەسێك ناتوانیێ لاوازییەکانی خۆی پەردەپۆش بکات. گەرچی سەرۆکایەتی خۆی بەمجۆرە نییە و نموونەیەکی بێ هاوتای هەڤاڵێتییە.

شەڕێك لەپێناو ئەوە پەیڕەودەکەم تاوەکو لای ئێوە پەسند بکرێم، ئەمەش هەستێکی زۆر بەکاریگەرە و پێویستە بەگرنگی پێدانەوە لەسەری بوەستن. بەڵام چۆن وادەکەم لەلای ژنان پەسند بکرێم و لێم رازی بن؟ ئەمەش بابەتێکی گرنگ و مەزنی سەربەخۆیە. تەماشای پیاوەکانی تری نێو خۆمان دەکەم، دەبینم کە هیچ لەتێگەیشتن و هەستی ئەوەدا نییە چۆن دەوروبەر رازی دەکات و چۆن پەسندیدەکەن، تەنیا هەوڵدەدەن دەستیان بەسەردا بگرن و باڵادەست بن، ئەمەش رەوشێکی زۆر قرێژە و بەئێش و ئازارە، چل ساڵە خۆم بەرێوە دەبەم تاوەکو دەوروبەرم لەخۆم رازی بکەم و پەسندم بکەن. بەڵام هەروەکو چۆن شەڕ رووداوێکی مەزنە، شانبەشانی پەسندکردن و رازیکردنی دەوروبەر سەبارەت بەخۆم لەهەمانکاتدا پەسند کردن و رازیبوون لای منیش وەکو دەریایە، من دژی ئەوە نیم هەڤاڵێتی لەگەڵ ژنان بکرێت، بەڵام پێویستییەکانی جێبەجێ ناکرێت. ئێوە هەستی پێناکەن و تێناگەن کە منیش دڵ و هەستم هەیە و تاوەکو تێنەگەم ناتوانم بژیم. ئێوەش تاوانتان گەلێك زۆرە. زۆر بەئاسانی دەخەڵەتێنرێن و بەردەوام بۆ خەڵەتاندن کراوەن، ئەمەش کەسایەتییەکی قرێژە، سەرەڕای ئەوەی پیاوەکانتان بەمجۆرەن، بۆچی بەقووڵایی تێناگەن و چارەسەرییەك نادۆزنەوە؟ هەربۆیە زۆر زەحمەتە پەسندتان بکەم. لەکاتێکدا بۆ پەسندکردنی خۆم بەشێوەیەکی سەیر و سەرسووڕهێنەر خۆم ئاراستە دەکەم، لەهەمانکاتدا ئەم راستییەش دەبینم کە بۆ پەسندکردنی ئێوەش پێویستی بەشەڕێکی بێ وێنە هەیە و بەشێوەیەکی سەرسووڕهێنەر بەرێوەتان دەبەم.

رەوشمان بەمجۆرەیە، نازانم لەمە زیاتر چیمان لێدەخوازن؟ بەگوێرەی من ژیان لەگەڵتان و بوونم بەموڵکی ئێوە بەشێوەیەك بەدیهاتووە کە نموونەی نەبووە. ئەمەش تەنیا لەلایەنی هەست و سۆزەوە نییە، بەڵکو

هەروەکو دەبینن یەکێتییەکە لەڕێگای تێکۆشان و هزرەوە, ئەمەش یەکێتییەکی قەشەنگ و ڕێکوپێکە. پێویستە بەهۆشیاری و تێگەیشتنەوە ڕەوشی من هەڵسەنگێنن. کاتێك دەڵێم بەتێگەیشتن و هۆشیارییەوە مانای ئەوەیە کە پێویستە ئەوەی بەرامبەریش بەلایەنی کەم خاوەنی جددیەتێك بێت تاوەکو بتوانێ ئەم پێوانانە بەهادار ببینێ و ڕێزی لێبگرێت, ئەگەر بەمجۆرە نەبێت تووڕە دەبم و بەهیچ شێوەیەك لێی نابوورم. هەروەکو چۆن باوەڕیم بەمەزنایەتی ژن هەیە, لەهەمانکاتدا ئەوەی وەڵامی ئەم پێوانانە نەداتەوە و جێبەجێیان نەکات, ئەوا دوژمنێکی لەمن گەورەتری نابێت.

ئەمانە واقیعین و ڕاستن. بەهیچ شێوەیەك ئەمە لەڕێگای بەزۆر سەپاندنەوە نییە, ئەگەر دەخوازن و لەبەرژەوەندی خۆتاندا دەبینن دەتوانن لەگەڵماندا بمێنن. ئەگەر نا لەبەرژەوەندی خۆتانی نابینن و ناخوازن لەگەڵماندا بن, ئەوا هەموو جۆرە ئاسانکاری و یارمەتیەکتان دەدەین و بەو شوێنەتان دەگەیەنین کە ئێوە دەخوازن. بەڵام ناخوازین بەهەرزانیش بمرن. هەروەکو چۆن ژیانێکی هەرزان لەنێو کاروانی ئێمەدا بوونی نییە" لەهەمانکاتدا مردنی هەرزانیش نییە و نابێ. تەواوی ئەمانە پرەنسیپن, ئەگەر گرێدراوی ئەم پرەنسیپانە بن, دەبێت. بەپێچەوانەی ئەمە من مرۆڤی لاواز و بێچارە پەسند ناکەم, تەنانەت ئەگەر دایکیشم بێت, بێگومان لەمیانەی کار و پراکتیکی خۆمدا ئەم ڕاستیەمان نیشانداوە. ئیتر ڕازی بن یاخود نا من بەمجۆرەم. هەروەها لەدیموکراتبوون بەولاوە من کەسایەتییەکم کە بژاری ئازادنە بەبنەما دەگرم. ئەگەر بێتو جددی بن مەزن دەبن و بەهادار دەبن, ئەگەر نا بڕۆن سەرتان لەو بەرد و لەم بەرد بدەن.

لەلای من ژیان لەگەڵ ژن بەمانای ژیان دێت لەگەڵ سەرچاوەی ژیان

وابزانم ئێوە لەڕابردوو هەندێ جار چوارینەی ئەشق و دڵداریتان بەدیاری پێشکەش بەکچان دەکرد, یاخود ئەم جۆرە چوارینانەتان بەدیاری پێشکەش دەکرا, من هیچ کاتێك بیرم لەشتێکی بەمجۆرە نەدەکردەوە, تەنانەت شتی وابچووکم پێشکەش بەدایکم و ئەو کەسانەش نەکرد کەڕێزی تایبەتم بۆیان هەبوو. بەهادارترین دیاری کە دۆزیمەوە ئازادییە! ئەگەر سەرنج بدەن دەبینین کە لەئاکامی ئەم دیاریە مەزنەیە هەمووتان لەگەڵماندان. واتە گرێدانتان بەژیان واتە لەهەلومەرجێکی وا زەحمەت و دژوارادا بۆ ئەو دیاریە مەزنە دەگەڕێتەوە کە پێتاندراوە.

لای من یەکێتی و ژیان لەگەڵ پیاو بەمانای ئەوە دێت کە یەکێتی و بەیەکەوە ژیان لەگەڵ کەسایەتی سەرکەوتنی مەزنە. لەهەمانکاتدا ژیان لەگەڵ ژن بەمانای ژیان دێت لەگەڵ سەرچاوەی ژیان.

پەیڕەوکردنی پرەنسیپ و بەها مورالی و ڕەوشتیەکان و فەلسەفەی من لەڕێگای زەبر و ناچارەییەوە نابێت. بێگومان سیاسەت لەنێو فەلسەفەدا نییە. مەزن بوونی چەمك و موراڵ و ڕەوشت لەفەلسەفەدا هەیە, ڕەوشتیش دەکەوێتە نێو فەلسەفە. ئەگەر هزری مەزن و بەهای پیرۆز و مەزن هەبێت ئەوکاتە بەیەکەوە ژیان دەبێت. واتە ئێمە لەسەر بنەمای وابەستەیی سیاسی و هەستی هەرزان لەگەڵ یەکتردانین, پێویستە زۆر بەباشی لەتەواوی ئەم ڕاستیيانە بگەن.

ناڵێم تەنیا لەگەڵ من بن, ئەمەتان بەسەردا ناسەپێنم کە ببنە چەکی دەستم. بەڵام چەکێکی زۆر بەکاریگەرە. بەگوێرەی من ئا لەم خاڵەدا مرۆڤ زۆر بەباشی لە "زیلان" دەگات کە چالاکیەکی هەرە مەزنە,

لێرەدا ئەم راستینەیە زۆر بەزەقی و ئاشکرایی دەرکەوتۆتەروو و, پێویستە لەم خاڵەدا مەسەلەکە قاڵبکەینەوە. ئەم راستیەش سەلمێنرا کە بەهێزترین و بەکاریگەرترین چەکە. هیچ پێویست ناکات من باسی بکەم چونکە ئەم راستییانە لەتەواوی ئەو نامانەیدا هەیە کە گەوهەری وەسیەتێك لەخۆوە دەگرێت, بەشێوەیەکی زۆر روون باس لەوە دەکات کە چۆن یەکێتی لەگەڵ سەرۆکایەتی بەدیدێت و چەکێکی چەندە بەکاریگەرە و لەبواری کرداریدا پەیرەویکردووە. بەگوێرەی من ئەوگەوهەرەی لەوێدا هەیە زۆر زەق و ئاشکرایە و زۆر مەزنیشە. ناشێ و نابێ مرۆڤ سەری سوورنەمێنێ و سوجدە بۆ ئەم گەورەییە نەبات, کاتێك بەمجۆرەش بێت ژیانێکی زۆر جیاواز دێنێتە ئاراوە. ئەمەش کارێکی شۆڕشە و پێیەوە خەریکن, لەگەڵ ئێوە پەرە بەشۆڕش دەدەین. بەچەکی شۆڕشەوە دەتان ئاخنێنە نێو شۆڕشەوە یاخود دەتوانن لەگەڵ شۆڕشەوە بەڕێوە بچن. ئێستاکە لەڕێگای شۆڕشەوە دەتوانن بژین. هێشتا بەوە ناڵێن ژیان, هەڵبەتە ژیانیشمان ژیانێکی ئاسایی نییە و کاتیشی نەهاتووە. ئەگەر شۆڕش بەسەرکەوتن بگات و ئەوانەی لەدوامانەدێن خیانەتمان لێنەکەن و گرێدانێکی مەزنیان بە بەها موراڵیەکان و ئەو راستییانە هەبێت, بەگوێرەی من ئەوکاتە لەسەر بنەمای میراسی ئازادکردنی ژیان جیهان بەدیدێت.

گرێدان بەسەرۆکایەتی تاڕادەیەك لەگرێدان بەپیرۆزییەوە دەچێت. لەم لایەنەوە بەردەوام من بەکار دەبرێم. لەڕاستیدا من بۆ ئەوە ناژیم کە داخوازیەکانم بەسەرتاندا بسەپێنم. لەڕاستیدا ناچارم چونکە بونیادنانی نزیکبوونەوە لەئێوە و هاوبەش بوون لەژیاندا وەکو فەرمودەی خودا بۆمن دێت. با ئەمە بەکار نەبرێت, چونکە رێگا لەپێش هۆشیاربوونەوەیەکی مەزنی ژنان دەکاتەوە. من مرۆڤێکم کە بەردەوام لەژنان رادەکات. بەڵام بەردەوام خودا پێم دەفەرموێ: لایەنگری ژنان بکە و بەشێوەیەکی جوان و ئازاد لەگەڵیاندا بژی, چونکە مرۆڤایەتی قازانج دەکات, ژنان قازانج دەکەن. بەڵام هەندێ کەس ئەمە بەکار دەبەن. ئەوەی دەخوازێ لاسایی من بکاتەوە زۆر پیس و قرێژە. ژیانی من لەگەڵ کەسایەتی ژنان زۆر جیاوازە" وەکو نیگارکێشێك و پەیکەر سازێك وێنەی تاکە تاکەی کەسایەتییەکان دەکێشم تاوەکو شتێك بەرهەم بێنم و دەرخەمەوە روو. ئەمەش بۆ لەنێوچوون نییە. تەنیا ژنێك نییە کە لەژیاندا لەگەڵم هاوبەش بووبێت و دوایی گوتبی من تاڕادەیەك ونم کرد و دۆڕاندم. تەواو بەپێچەوانەوە ئەگەر بەهێزبوون شتێکی باش بێت. ئەوا بەردەوام بەهێزبوون لەهەست و نەستدا بەدیهاتووە.

ئەمە شۆڕشە, لەڕێگای ئەم شۆڕشە ژنی شۆڕشگێڕ پێشدەخەم و بەهایەکی مەزنی پێدەدەم. با پێشبکەوێت, بۆچی لەپێشکەوتنی ژنی شۆڕشگێڕ بترسین؟ پێویستە شانازی بەوە بکەین کە لەگەڵ ژنانی شۆڕشگێڕ دەژین و زۆر دڵنزم بین. ئێوە تەنیا دەڵێن: چۆن دەست بەسەر ژندا بگرم و بە چ شێوەیەك بەخۆمیەوە گرێ بدەم و بیکەمە موڵکی خۆم؟ ئەمە کەسایەتییەکی داتەپیوە. ئەمە خیانەتێکە لەئەشق و خۆشەویستی دەکرێت. پێتان دەڵێم ئیتر نەبنە داردەست و کۆتایی بەم رەوشە بێنن! ناخوازم دووبارەی بکەمەوە, تاوەکو دوایی سلاومان لەکەسایەتی سەرکەوتوو هەیە! ئەگەر بەمجۆرە بێت هیچ مەترسییەکی ئەوە نییە بڵێن بەدڵەوە لەگەڵتاین, ئەمە تایبەتمەندییەکی سەرەکی رەوشی ئێمەیە. بەڵام بەرامبەر بەو کەسەی دیماگۆجیەت دەکات و دەسەڵاتی بەشێوەیەکی هەرزان و خراپ بەکاردێنێ و دەخوازێ دەرفەت

لەلاوازيەكانتان وەربگرێ و بەكاريان بێنێ و دەخوازێ بتانخات, ئەوا پێويستە بەرامبەر بەو كەسانە وەكو گورگ بن. نابێ بەهيچ شێوەيەك دەستبەرداری لەبەهاكانی ژنان بكەن و تەنازولی لێبكەن. بۆچی ژنان وەكو شتێكی بێ بەها بگرێتە دەست؟ بۆچی هەرزان بەكاريبێنێ؟ بۆچی شانبەشانی ئەو مەزن نەبێ؟ بۆچی لەگەڵ ئەودا تەواوی جوانيەكانی ژيان ئاوا نەكات؟ لەهەمانكاتدا ئەمە وڵات و ئازادی و ژيانی گەلە. ئەگەر سڵاو بدەنە پياوێك كە بەمجۆرە نەبێت, ئەوا خۆتان ون دەكەن و دەدۆڕێنن.

بەڕێوەچوونتان لەگەڵ من مانای ئەوەيە كە لەگەڵ كاروانی سەركەوتن بەڕێوە دەچن. بەڕێوەچوون لەگەڵ من بەمانای بەڕێوەچوونتانە لەگەڵ هێزی پارتی. بەڕێوەچوونتان لەگەڵ من مانای هەنگاو هاوێشتنە بۆ بەرزترين ئاستی گرێدان و ئومێد و شكۆمەندی, ئەمە شتێكی زۆر ئاشكرايە كاتێ لەگەڵ مندا بن بەم شێوەيە. واتە پێويست ناكات هيچ كەسێك بەشێوەيەكی هەڵە ناوی لێ بێنێت, گرێدانێكە كە زۆر لەگرێدانی ژن — دۆستايەتی بەهادارترە. بۆنموونە لەنێو كۆمەڵگادا لەگەڵ دۆست و ژنەكەيدا بەمجۆرە ياخود بەوجۆرە دەژيت, لەگەڵ خۆشەويستەكەی بەجۆرێك دەژيت. بەڵام هی من تاڕادەيەكی بەرز ئەمانە تێپەڕدەكات. هەر بەهۆی جێگا و شوێنی كەسايەتيەكەم ئەم زاراوانە لەمن ناوەشێتەوە و لەجێگای خۆيدا نييە. من ناچاری ژيانێكتان دەكەم كە لەسەرەوەی تەواوی ئەمانەيە و ژيانێكی زۆر مەزنە, پێويستە بەهيچ شێوەيەك لەمە نەترسن. لەگەڵ مێردێكی پيس و, تەنانەت لەگەڵ منيشدا ئەگەر ژيانێكی بێناوەڕۆكتان بينی و مەردايەتی تيا نەبوو و لەسەركەوتن دوور بووم, ئەوكاتە مشتم بۆ باوێژن و جوێنم پێ بدەن, ئەی وانييە؟ شتێكی سەيرە, بەڵام بەگوێرەی من پێويستە بەمجۆرە بێ.

ئەگەر توانيبم بەكەسايەتيەكی سەركەوتوو بگەم ــ بێگومان بەيادی هەڤاڵانی شەهيد باس لەمە دەكەم — تاوەكو دوايی لەگەڵ مندا بن و منيش توانيم تاوەكو دوايی لەگەڵياندا ببمە يەك, ئەوا شكۆمەندترين يەكێتی و بەيەكەوە ژيان ئەمەيە. بەرگەگرتنی ئەم هەموو گەردەلول و ناخۆشی و برسێتيەی چياكان ئەمە پيرۆزترين و شكۆمەندترين يەكێتييە. كێ دەتوانێ ئەمە بەناتەواوی ببينێ؟ كام دوژمن دەتوانێ لەكەداری بكات؟ بێگومان پێويستە ئەمە بەكارنەبرێت و تەنانەت نەكرێتە بابەت و رۆژەڤی گفتوگۆش. من تاوەكو ئێستاش لەوە باوەڕم كە, كاروانی من كاروانی سەركەوتنە و ئەمەش دەسەلمێنم, هەروەها ئەمە جوانترين رەوشتيشە. ئەگەر بێتو ژنێك بەشێوەيەكی جوان و زيرەكانە گرێدراوی كاروانی سەركەوتن بێت هيچ شتێك لەمە بەهادارتر نييە. لێرەدا باسی گرێدان بەتاكەكەسێك ناكەين. لێرە بەشكۆمەندی هزرێك و رێچكەی كاروانی سەركەوتنەوە گرێدەدرێن و ئەم گرێدانەش بەردەوام دەبێت. ئەگەر بەشێوەيەكی دروست خاوەن لەيادی ئێمە و شەهيدان دەربكەون, ئەمە بەمجۆرەيە.

لەم چوراچێوەيەشدا يەكبوون لەگەڵ ژن تا دواڕادە جێگای شانازييە و شوورەيی و عەيب نييە. ژن لەجەستەيەوە بگرە تاوەكو دەگاتە هزر و بيروبۆچوونی و گيانی هەمووی بێگەردە و يەكلابۆتەوە, بەگوێرەی من كەسايەتی پياو پڕيەتی لەدرۆ و تەڵەكەبازی و لەم لايەنەوە زۆر پێشكەوتووە. بەگوێرەی من ژنان بەڕادەيەكی كەمتر نزيكی درۆن. كاتێك كەسايەتی ژن ئازاد بێت, ئەوا لەئاستێكی بەرزدا كەسايەتييەكی بێگەرد دەردەكەوێتەڕوو كە دوور بێت لەدرۆ و فشار, ئەمەش زۆر بەهادارە. بێگومان پياوی كورد

لەڕەوشێکی زۆر خراپدایە, بەهیچ جۆرێك نـاخوازێ لـەم مەسـەلانە بگـات. بـەڵام ئـەرکتان ئەمەیـە لەمیانـەی شـەڕدا پێشـیبخەن. هـەروەکو گـوتم ئەمـەش شـەڕ و تێکۆشـانە لـەپێناو ئەشـقدا. هـەر هـەمووی بەیەکـەوە گرێدراون, هەم پێویستی و ناچارییەکە و لەمەش بەولاوە هیچ ڕێگایەکی دیکەمان نییە.

سەبارەت بەگرێدانی ئێوە هیچ ترس و دوودڵیەکم نییە, بەڵام دوودڵی و ترسم بەرامبـەر بـەپیاوان زیـاترە. بێگومان بورغوی مێشکمان دوژمنە, هەناسە بەهەناسە بەچواردەوری مێشکماندا دەسـووڕێنەوە. ئەگـەر ئـەم ڕەوشە چارەسەر نەکەین بەهیچ شێوەیەك نـاتوانین لەگەڵتانـدا بـژین. تـا چ رادەیـەك دوژمـن شـیبکەینەوە و ئاشکرای بکـەین, ئـەوا هێنـدە دەتـوانین لەگەڵتانـدا بـین. هەربۆیـە پێویسـتە ئـەم تێکۆشـانە مـەزنتر بکـەم, بەهۆشیاری و دروستی و سەمیمیەتەوە ئەمە دەڵێم. هەرچەندە زەحمەتیش بێت تێکۆشانێکی مەزن لـەپێناو ئەوە پەیڕەودەکەم کە لەگەڵتاندا بەیەکەوە بین. ئەم شەڕ و تێکۆشانەشم لـەپێناو ئـەوەدا نییـە کـە لـەپێناو شۆڕشێکی سیاسی ـ کۆمەڵایەتی ڕەها و تێکدانێکی ڕەها ئەنجامبـدەین, تـەنیا بـۆ ئـاواکردنی سیسـتەمێکی سۆسیالیستیش نییە, ئەم شەڕ و تێکۆشانە مەزنەم لەپێناو ئەوەدایە کە لەگەڵ ژنی ئازاددا بژین.

ئەگەر بێتو دەرفەتی ئەوەم هەبێت بەهزرێکی مەزنتر و تەکتیکی کارامەتر و بارێکی مەزنتر کاربکەم, ئـەوا ئاوا باوەڕ دەکەم ئەمە بەدیبێنم و بەئەنجامی بگەیەنم.

ئەمە زیاتر لەبواری تیۆریدایە و دەخـوازم لـەمیانی شـەڕ و تێکۆشـاندا قۆنـاخی سـەرەتایی پتـەو و تـەواو بکەم. بەڵام ئەو هێـزەی کـە هەمـە لەتوانایدایـە بەشـێوەیەکی زۆر لێهـاتوو و کارامـە لەهەلومـەرجی ئاشـتیدا بەکاریگەرتری بکات. هێزم تێری ئەوە دەکات. مرۆڤ هەرچی بێت لـەواری جەسـتەییدا لـەنێو دەچـێت. بـەڵام هزر و بۆچوون و هێز و توانستە هیچ کاتێك لەنێو ناچێ. هەر لەبەرئەوەی ئەم هزر و بۆچوونانەمان پێشخست باوەڕدەکەم کە لەنێو ناچین و بەنەمری دەمێننەوە. وابیردەکەمەوە لەبـەر ئـەوەی ژیانمـان گرێـدراوی هـزر و هەستێکی مەزنە بۆیە بەفیڕۆ ناچێت. ئەو کەسایەتییانەی گرێدراوی ماددیەت و ئارەزووی ڕەهان لەنێو دەچن و نامێنن.

ئەوەی بەهەمیشەیی و بەردەوامی دەمێنێ" ئاشـکرابووە و دەرکەوتۆتـەڕوو کـە ئـەم یـەکێتی و بەیەکـەوە ژیانەیە. بۆیە زیاتر بەهێزی دەکەین و درێژەی پێدەدەین و بەنەمری دەهێڵینەوە, لەم بوارەدا سـەرکەوتنیش بەدەست هاتووە. بەڵام دەخوازین بیکەین بەسەرکەوتنی تەواوی شۆڕش.

ئامانجمـان بەمجۆرەیـە, هـەم ئامـانجێکی مەزنـە و ئـیتر بـەرەو بـەدیهاتن و ئـەنجام گەیشـتن ئاراسـتەی وەرگرتووە و هەمووکمان بەرەو ئەو ئامانجە ئاراستە دەکرێین. واتە تەنیا باس لەوە ناکەین کە لەئاستی کادرۆ سەرکەوتن بخولقێنن و ڕێکخستنێکی بەهێز ئاوا بکەین. ئەمانەش ئاوا دەکرێن, بەڵام ئێستاکە ئەوە گرنگە کە دوژمنـانی ئـەم ژیانـەی پـەیڕەوی لێدەکـەین بـەلاوەبنێین و ئـەم ژیانـە بەسـەرکەوتن بگـات. سـەبارەت بـەم مەسەلەیە نەدەبێ زێـدەڕۆیی بکـەین و نـەدەبێ بکەوینـە نێـو چـەمکێکی بەپەلـەی سـەرکەوتن و نـەدەبێ وا هەڵوێستە بکەین کە سەرکەوتن لەئارادا نییە و لەئومێدێکی وشك بەملاوە شتێکی دیکە نییە.

جوڵانەوەکـەمان بەیـەکبوونی لەگـەڵ ژنـان بەتایبـەتی لەلایەکـەوە جـوان بـووە, هـەروەها لەهەمانکاتـدا لەمیانەی ئەو ئومێد و سەرکەوتنە کردارییەی لەئارادایـە بەشـێوەیەکی بـەهێز و کاریگـەر پێشـدەکەوێت. مـن

بەردەوام شانبەشانی ئەم جۆش و خرۆشەوە ژیاوم. لەو باوەڕەشدام لەم جۆش و خرۆشە بەملاوە هیچ شتێکی تر وا لەمرۆڤ ناکات کە بەم شێوەیە درێژە بەم خەبات و تێکۆشانە بدات. هەربۆیە ئەوەی لەهەموو شتێك زیاتر پێویستە, ئەم جۆش و خرۆشەیە, جۆش و خرۆشیش هەوڵ و تێکۆشان لەگەڵ خۆیدا دێنێ, هەوڵ و تێکۆشانیش سەرکەوتن بەدیدێنێ.

لەراپۆرتی سیاسی سەرۆکایەتی بۆ کۆنگرەی دووەمی **PJKK**, وەرگیراوە

نابێت لەپێشکەوتنی ژنان بترسیت, بەڵکو بە پێچەوانەوە پێویستە پێی سەربەرز بیت. من تاوەکو دوایی پشتگیری لەبەهێز بوونی ژنان دەکەم. سەرۆکایەتی بە هەموو هێزو توانای خۆیەوە و لەهەموو بوارێکەوە ژنی بەهێز کردووە. ئەمەش راستیەکە و نابێت تەنیا بۆ ساتێکیش فەرامۆش بکرێت. نابێت لەبەهێزبوونی ژنان بترسن, چونکە هەموو کاتێك بە گوێرەی فەلسەفەی ئێمە" بەهێزبوونی ژن بە هێزبوونی پیاوە, بەهێزبوونی کۆمەڵگایە. " مارکس " ئەمە بە رستەیەکی بەمجۆرە فۆرمیلە دەکات" ئاستی ئازادی ژن, ئاستی ئازادی کۆمەڵگایە. ئێمە تا ئاستێکی بڵندتر ئەمەمان پێشخست. ئاستی ئەو ئازادییەی کە لەژندا بەدیهاتووە, ئاستی ئەو ئازادییەیە کە پیاوێتی پێیگەیشتووە, هێزی ژیان کەلای ژن بەرجەستە بووە, هێزی ژیانی پیاوە, هێزی ژیانی کۆمەڵگایە. ئەمانە راستن. پێویستە سەبارەت بەم مەسەلانە هاوکاری بکەن. نابێت فشار و سەرکوتکردن پەیڕەو بکەن, بەڵکو دەبێت رێگایان لەپێش بکەنەوە. نابێت کۆسپیان بۆ بنێنەوە و تاکڕەو بن, بەڵکو پێویستە گشتگیر و کۆمەڵکار بن.

شتێکی زۆر مەترسیدارە کە لەژنێك دا بەدوای هێز و ژیاندا بگەڕێیت, کە وەکو کۆیلە بە تۆوە گرێدراوە. تەماشای من بکەن" بەرامبەر بە ژن خۆم لەرەوشێکی بەهێزدا دەبینم. تەنانەت بە هۆی ئەو هێزە سیاسیەی نوێنەرایەتی دەکەم لەخۆم پرسی کە ئاخۆ دەرفەتی ئەشقم لەدەستدا؟ ئەمەش ئەو واتایە دەبەخشێت" کە لەمیانی توانست و تایبەتمەندیەکانی کەسێتی خۆم باوەڕیم هەبوو کە ببم بە ئەندامێکی ئەشق. ئەگەرنا دەتوانم لەرێگای پشت بەستن بە دەسەڵاتی خۆم نەتەوەیەك یاخود چینێك و تەنانەت رەگەزێکیش بکەم بە کۆیلە. بەڵام لەوێدا ئەشق, بوونی نابێت. مسۆگەر ئەشق دیاریدەیەکە پەیوەندی خۆی بە توانستی ئازادانەی تاکە کەسەوە هەیە. کاتێك تا ئەم ئاستە بەرز و بێ بەزەییانە هێز بەرامبەر ژن بەکاربهێنرێت, ئەوا تۆ ئەشقی راستەقینە ناخولقێنی, بەڵکو کۆیلەیەکی بێ هاوتا دەخولقێنی. دەشێ گرێدراوی تۆ بێت, بەڵام دەبێتە هاوبەشی تاوانەکانت و ئەشق لەنێوانتانا بوونی نابێت.

ئیدی بەسە, چی دی تایبەتمەندیە خەرەکی و کلاسیکیەکانی پیاوێتی بەکارنەهێنین. ئێمە لەم بارەیەوە باسی کوشتنی لایەنە رووت و شازەکانی پیاوێتیمان کرد. پێویستە پەیوەندی سێکسی رووت و رەها و هێزی جەستەیی بەرامبەر بەژنان بەکارنەهێنرێت, ئەمە هەم بێ رەوشتییە, هەم لەبواری سیاسیش دژایەتی کردنی سۆسیالیزمە. لەجیاتی ئەمە پێویست دەکات خاوەنی کەسایەتییەك بن کە ژن بەهێزبکات و ژیانی نوێش لەنێو پیاواندا بێنێتە ئاراوە. ئەگەر ئەم هێزە نیشان بدەن پیاوێتیتان نامرێت, بە پێچەوانەوە بەڵکو ناسنامەی پیاوێك دەردەکەوێتەڕوو کە پەسند بکرێت. پیاوێکی بەمجۆرە ئەو پیاوە نییە لەپێناو ژنێکی خاوەن چەمکی راست و بەرێز یاخود لەپێناو هەست و سۆزێکی بچووك هەرا بنێتەوە, بەڵکو بەواتای ئەو پیاوە دێت کە خۆشەویستی ژن بەگوێرەی خۆشەویستی وڵات و ئازادی گەل دەستنیشان دەکات. ئەگەر لەم بارەیەوە سەرکەوتن بەدەست بێنێ, ئەوا دەبێتە پیاوێك کە بەرێزەوە نزیکی ژن دەبێتەوە و خۆشیدەوێت. پێویستە باش بزانن کە تاوەکو لەو ئاستەنگییانە تێنەگەن, ئەوا لەژێر کاریگەری ئەو تەگبیرانەی کە پارتیمان وەریگرتووە ناتوانن لەگەڵ ژن لەناو ژیاندا پەرە بەپەیوەندی بدەن. ئەمە لەتەگبیرێك زیاتر, پێویستە وەکو

بەهایەکی مۆڕاڵ و فەلسەفەی ژیان ببینرێت کە بەسەر ژیان و ناسنامەکەماندا زاڵە. پێویستە بەدڵشادی و جۆش و خرۆشەوە ئەمە ئەنجام بدەن.

لەسەر ئەم بنەمایە پەیوەندیداربوون بەتێکۆشانی ژنان, جۆش و خرۆش دەبەخشێ و بەدڵنیاییەوە هیچ تەنگەتاوییەك دروست ناکات. پەیوەندی تاکرەوی و بۆگەن و دابڕاو لەئامانج و دوور لەشکۆمەندی, ئەو پەیوەندییانەی کە گەیشتوونەتە خاڵی لەنێوچوون, هێندەی خیانەت مەترسیدارە.

ئەو هەڵوێستانەی کە وایکردووە پیاو لەسەر لێواری لەنێوچوون بێت, ئەوەیە کە ژن بچووك دەکاتەوە و تەنانەت خۆشی هەڵنەسەنگاندووە. بەدڵنیاییەوە لەجیاتی ئەمە پێویست بەپیاوێك دەکا کە باوەڕی بەهێزی ژنان بکات و لێی تێبگات و بگاتە چەمکێکی راستی خۆشەویستی. دەبێ باش بزانرێ کە بەئەندازەی دڵنزمی پێویستە ئەوە ببینرێت کە مەرجێکی دیکەی بەدیهێنانی سەرکەوتن, لەشەڕی وڵاتپارێزی دایە. نزیکبوونەوە و کەسایەتییەك پێویست دەکات کە نوقمی ناو تاکرەوێتی نەبووبێت و هیچ شتێك لەپێناو تاکرەوێتی رەچاو نەکات و لەسەر بنەمایەکی کوێرانە نزیکی ژنان نەبێتەوە, دەبێ خۆشەویستی بەکەسایەتییەکی سەرکەوتوو گرێبدات و نابێ هەناسەی لەبەر بڕابێت. دەبێ مەحکومی غەریزەی تەسك نەبێت و لەنێو هەڵوێست و نزیکبوونەوەیەکی وەها نەبێ کە هەر شت بەماڵ و موڵکی خۆی بزانێت. ئەگەر بێتو لەسەر بنەمای کەسایەتییەکی سەرکەوتوو نزیکبوون بەرامبەر بەژن پێشبکەوێت ئەو کاتە دەشێ کەپەیوەندی پیاوان لەگەڵ ژنان بەهادار بێت. دەبێ باش بزانرێت کە هەڵوێستێکی پێچەوانەی ئەمە هیچ بەهایەکی نییە. پیاوێك پشت بەژنی لاواز ببەستێت ئەو پیاوەش لاوازە, ئەو پیاوەی پشت بەژنێکی کۆیلە ببەستێ, کۆیلەیە. پیاوێك کە لەسەر بنەماکانی ئازادی خاوەن چەمك و تێگەیشتن نەبێت, ئەگەر شۆڕشیش ئەنجام بدات, ئەوا لەمیانی ئەو چەمکەی بەسەر کۆمەڵگادا دەیسەپێنێ, نوێنەرایەتی چینی سەردەست دەکات. هەروەکو دەزانرێت پیاوێك لەنێو ئێمەدا نییە شۆڕش ئەنجام بدات. هۆکارەکەشی ئەوەیە کە ئاستی ئازادی لەخۆیدا شینەکردۆتەوە و چارەسەرەی نەکردووە! بەڵکو بەپێچەوانەوە نزیکی ئەم کێشەیە دەبێتەوە, ئەگەر لەجیاتی هەڵوێستی پەردەپۆش کردن و سەرکوتکردن ئاستی تێگەیشتن و ئیرادەتان بەرزبکەنەوە, ئەوا بەئەندازەیەکی مەزن توانستی شەڕ و تێکۆشانتان زیاتر دەبێت, بەڵام کاتێك بەرامبەر بەغەریزەکانتان تێکبشکێن و بکەون, ئەوا ئازایەتی نامێنێت و لەناودەچێت.

پیاو بێت یاخود ژن, ئەگەر تاوەکو دوایی خاوەنی وڵاتپارێزی و ئازادی بێت و لەم پێناوەشدا شەڕ و رێکخستن و بەسوپابوون وەکو ئامرازی پێکهێنانی ئەوانە ببینێت و لەو رێگایەشدا توانستەکانی خۆی بخاتە گەڕ, ئەوا ئەم ژنە, یاخود ئەم پیاوە بەهادارە. ئەوەی بەشێوەیەکی قووڵ دەرکی بەڕاستینەی خۆی نەکردبێت, نابێتە خاوەن شەڕ و تێکۆشانێکی بەرفراوان و تێر و تەسەل, ئەوانەی راستینەی خۆیان رەچاو نەکەن و لەم پێناوەشدا نەکەونە نێو لێگەرینێك و بڵێن ئێمە شەڕی ئازادی بەڕێوەدەبەین, ئەمە دەبێتە خۆ هەڵخەڵەتاندن.

ئەو پیاوەی کە خۆشەویستی و ژیانێکی یەکسان و هاوبەش نەناسێت, بەتایبەت لەو خاڵەی کە تێیدا شەڕی لەدەست داوە, ئەوا پەلاماری ژن دەدات, هەروەها ژن وەك ئامرازی هەڵاتن بەکار دەهێنێت, ئەو

پیاوەی رق و کینی خۆی بەهۆی گەندەڵ بوونییەوە بەسەر ژندا دادەرێژێت, ئەوا ئەمە بەواتای ئامرازی زوڵم و ستەم دێت. گەلێك کەس هەبوون دەیانخواست ژن بکەن بەئامرازی ڤالا دەرخستنی شەڕ, ئەمەیان لەژێر ناوی بەرێوەبەر, فەرماندە ئەنجام دەدا, بەمرەنگە جارێکی تریش ئەمە رووبەڕوومان بووەوە" واتە هەم داگیرکردن و دەست بەسەرداگرتن, هەم ئەو پیاوەی نۆکەرایەتی ئەو دەکات, زۆر بێ ویژدانانە رووبەڕوومان بووەوە. دەبینین پیاو لەو شوێنەی کە لەدەستی داوە, ژن وەکو یەکەمین ئامراز بەکاردەهێنێت و پەلاماری دەدات.

لێرەدا ناچارین نموونەیەکی روون و ئاشکرا بهێنینەوە" ئەو بێ کاریگەر بوون و سنووردارییەی کە دوژمن دەیخواست بەسەر ئێمەدا بیسەپێنێ, یەکێکی وەکو " شەمدین ساکیك " بەڕەنگێك پێکی دەهێنا کە دوژمن چاوەڕوانی نەدەکرد, شەمدین ئەو هێز و توانستەی کە لەناو پارتیدا کەوتبووە دەستی, کە بەهیچ جۆرێك شتێکی وای لەبنەماڵەی خۆشیدا نەبینیبوو, بەچەپەڵ ترین و گەندەڵترین شێوە بەکاری دەهێنا و بەمرەنگە پیاوی لەبەرامبەر ژن, ژنی لەبەرامبەر پیاو بەکاردەهێنا و خراپەکاری دەنایەوە و, دەیخواست بەمشێوەیە ئەنجام بەدەست بهێنێت. ئەو دەیخواست فەرماندە و سوپایەکی ساختە و بەکرێگیراو بخولقێنێ, بەڵێ وەکو دەزانرێ یەکێك لەچەکە سەرەکییەکانی پارتی بەکاردەهێنا, ئەویش ئەوە بوو کە کچانی پارتی پێشکەشی پیاوان, پیاوانی پارتی پێشکەشی کچان بکا, واتە بەشێوەیەکی زۆر سەیر پشتی خۆی بەشێوازێکی وەها بەستووە کە تەنانەت شەیتانیش پەی پێنەبردووە و بیری لێنەکردۆتەوە.

کەسایەتی ژن ـ پیاو, تا دوارادە لاوازە و لەبەرامبەر زۆر و زەحمەتییەکاندا بەرگە ناگرن, لەم نێوەندەدا کاتێك لەلایەنی مەسەلەی زایەندیدا تینوێتی زایەندی بەبنەما دەگرێت و پشت بەجوانی نابەسترێت, ئەوا تێکەڵی زۆر دژوار دەبێت. ئەم چەمکانە لەنێو پارتیدا بەڕەنگێك زەرەر و زیانیان لێکەوتۆتەوە کە لەهیچ کاتێکدا دوژمن نەیتوانیوە بەمرەنگە بکات.

ئەگەر سنوورێك بۆ ئەمە دانەنرێت, ئاشکرایە کە هیچ سوپایەکیش ناتوانێ لەبەرامبەر ئەم مەترسییانەدا بەرگە بگرێت. لەبەرامبەر ئەمەدا تەگبیری ئێمە چیبوو؟ بەڵێ, پێویستە نکۆلی لەغەریزەکان نەکرێت, ئێمە سەرەرای ئەو هەموو زۆری و زەحمەتییە مەزنانە خواستمان ئەم دەرئەنجامە دەربخەین. مادام دوژمن ئێمەی تا ئەو رادەیە داڕووخاندووە, لەبەرامبەر ئەمەدا بەرپەرچدانەوە بە پێشخستنی فرە لایەنەی پەیوەندی نێوان هەردوو رەگەزە, هەروەها ئازادکردن و سەربەخۆکردنی جنسی, لە ئاستی جەستەییەوە دەگاتە ئاستی چەمك, هەروەها لەتایبەتمەندییە ئەستاتیکییەکانەوە بگرە تا دەگاتە تایبەتمەندییە جەنگاوەرییەکان و گەیشتن بەو راستییەی کە تاوەکو "پیاویش" شەڕ و وڵات قازانج نەکات, ناتوانێ ژیانێکی هاوبەش لەگەڵ ژندا بەسەر بەرێ, واتە بەئازادی ناگات. ئەمەش وەکو پرەنسیپێکی سەرەکییە. هەروەها هەوڵماندا ئەمە تاڕادەیەك لەکەسێتی خۆماندا بەرجەستە بکەین و بەم شێوەیەش بگەین بەئەنجام. لەڕاستیدا دەتوانرێ بگوترێ بەشێوەیەکی گەلێك زانستییانە وزەیەکی بەم شێوەیەمان, واتە گۆڕینی غەریزە قەبە جنسییەکان و تەنانەت غەریزەی برسێتیش بۆ کینێك لەبەرامبەر دوژمندا, خولیا ئازادییەکان, لەناوبردنی قرێژییەکان,

بەڕێوەبردنی کەسێتی جەنگاوەری راست, لەهەموو لایەنێکەوە ئافراند. دەستکەوتی ئەو تێکۆشانە واتە, قارەمانێتی ژن و پیاوە.

یەکەمین شت ئەوەیە" مسۆگەر دەبێ پیاو کاتێ کە سەیری ژن و YAJK, لەنێو PKK دا دەکات, دەبێ لەسەر بنەمای پرنسیپە باشەکان, وەك هێزێك پەسندی بكات, واتە دەبێ وەکو چۆن ناوی خۆی دەزانێ ئاوەهاش بگاتە ئەو راستییەی کە ناتوانێت وەکو رابردوو بەپشت بەستن بەدەسەڵات و فەرمانداریێتی پیاوێتی, ژن بۆ خۆی بەکار بهێنێت.

دووەمین شت ئەوەیە, ئەگەر پیاو خوازیاری ژن بێت, ئەوا ئەم ژنخوازییە لەسەر بنەمای وڵاتپارێزییەوە دەبێت و پێویستە وەکو کاری شەڕێك لێی نزیك ببێتەوە, لەشەڕدا ئازادی و لەناو ئەویشدا سەرکەوتن ببینرێت و ئەمە ناچارییەکە, کە واتە پیاوێکی دۆڕاو ناتوانێ ژن بخوازێ. واتە ئەو پیاوەی نابووت بووە و لەشەڕدا دۆڕاندوویەتی, نابێ داخوازی ژن بكات. ئەو پیاوەی کە خاوەنی سەرکەوتن نەبێت نابێ لەگەڵ ژندا بژی, هەڵبەتە ئەمە مەترسیدارە. من هەرگیز ناڵێم با پەیوەندی تایبەت هەبێت, ئەگەر پیاو خۆشەویستی و رێز بۆ رەگەزی ژن نیشان بدات و بەشێوەیەکی راست و دروست نزیك ببێتەوە, یاخود ئەگەر YAJK یش بخوازێت لەسەر بنەمای ئازادی و یەکسانی ــ بەواتای تایبەت ئەمە ناڵێم ــ وەکو چەمکێك و تەنانەت وەکو ژیانێك, پیاو پەسند بكات و, لەسەر ئەم بنەمایە لێپرسینەوە لەخۆی بكات و پێکی بێنێ, ئەگەر پیاویش لەسەر ئەم بنەمایە YAJK بەمجۆرە پەسند بكات, ئەو کاتە پەیوەندییەکان, خۆشەویستی و ئەشق واتادار دەبێ. ئەگەر بەوجۆرە نەبێت, ئەوا پێویستە YAJK ئەوان بەدوژمن بزانن.

با هێزی YAJK, خەباتگێڕانی YAJK سەیر بكەن" لەپیاودا وڵاتپارێزی پێش نەکەوتووە لەو شەڕەی بەڕێوەیان بردووە, پێداگری و سەرکەوتنێك نییە و, لەگەڵ راستینەی داخوازی پارتی یەکانگیر نابێ" دەبێ هێزی YAJK و خەباتگێڕانی ژن ئەو پیاوەی کە بنکەوتووە, وەکو دوژمن پەسند بكەن. لەم میانەشدا بەڕوون و ئاشکرایی دەڵێم" لەڕاستیدا پیاوێکی بەمجۆرە یاخــود ژنێکی بەکرێگیراو ـــ ژنیش هەیە لەپیاو دەچێت ــ بەشێوەیەکی بابەتی, سیخوڕن.

لەم خاڵەدا چەکی YAJK و هێز و بەرێکخراوبوونی ژنان لەگۆڕینی ژن زیاتر, چەکی گۆڕینی پیاوە و هێزی راستەقینەی گرێدانێتی بەشەڕ و گرێدانێتی بەپارتی.

ئەگەر پیاو خاوەن چەمکی راست بێت و نرخ بدات بە ژن, داوای حەزکردنی لێبکات و بخوازێت لەگەڵیا ببێتە هەڤاڵێکی باش و پێشی بخات و بەهێزی بكات" ئەوا دەبێ لەسەر غەریزەی خۆی زاڵ بێت و, باڵادەستی بخاتە لایەك و لەسەر بنەمای ئەم وتەیە کە "ژن بەواتای ژیان دێت" نزیکبوونێکی بەپرەنسیپ و دڵنزمی و راستگۆیانە بەرجەستە بكات. بەدڵنیاییەوە ئەگەر بەمجۆرە نەبێت ئەگەر منیش بم, ئەوا پێویستە رێز لەپیاوێکی وەها نەگیرێت.

لێرەدا هێنانەوەی یەك ــ دوو رستەی " فکری بایگەڵدی " سوودێکی زۆری هەیە کە, وەکو هەڤاڵێك زۆر بەجوانی لەئێمە تێگەیشتووە" ـ لەشارۆچکەی لیجەی سەر بەئامەد وەکو منداڵی خێزانێکی باش هاتۆتە

دونیاوە ـ دەڵێت: لەزیندانی " سەقاریا " بۆ زیندانی ئەستەنبووڵ گوێزرامەوە. لەساڵی 1994 دا بەتاوانی ئەندامێتی ڕێکخستن (واتە PKK) سزا درام و ئەوە نزیکەی چوار ساڵە لەزیندانی "چانقایا" دام.

(( سەرۆکی من!

تۆم زۆر خۆشدەوێت. دەتوانم تەنیا لەو چوارچێوەیەی بۆ ئەشقت دیاریکردووە, خۆشەویستی خۆم لەبەرامبەرت دەربڕم. چونکە ئەمە ئەشقێکی شکۆمەند و پیرۆزە و لەکەسێتی تۆدا ئەشق, بوون بە گەل و شەهیدان و مرۆڤایەتییە. تۆ تەواوی ئەوانەت لەکەسایەتی خۆتدا کۆکردۆتەوە. تۆ ئەو کەسایەتییە زانا و بلیمەتەی کە, تەواوی ئەوانە لەئاستێکی بەرزدا پەیڕەو و بەرجەستە دەکەیت. تۆ تاکە کەس نیت, بەڵکو چینێك و کۆمەڵگایەکی. لەبەرئەوەی چین و کۆمەڵگایەکی, ئەمە وایکردووە کە ئیمپریالیزم بەشێوەیەکی دژوار هێرش بێنێتە سەرتۆ. ئەوەی کە هەرە زێدە ئیمپریالیزم و هاوپەیمانەکانی لێیدەترسن ئەوەیە کە کورد ببێتە خاوەن هێز و دەسەڵات. ئەمڕۆ هۆکاری سەرەکی گەیشتنی گەلی کورد بەم ئاستە, دەگەڕێتەوە بۆ هەوڵە مەزنەکانت و شێلگیری و بەبڕیاربوونت لەسەر نەهێشتنی کۆیلایەتی لەکوردستان. بێگومان ئەم هەوڵە مەزنانەی تۆ, یەك بە یەك بەرهەم دەدات.

ئەو چەمك, دیاردە, بێکاریگەرکردنەی کە بەسەر پارتیدا سەپێنرابوو, پووچەڵکراوەتەوە. ئەمەش ئەو شێوازە بەڕێوەبەرایەتییەیە کە تۆ پێکت هێناوە. بەڕێوەبەرایەتییەکانت (UNITA) بەمردوویی دەرخستە مەیدان, لەکەسێتی شەمدیندا پووچەڵکراوەتەوە. ئیدی هیچ هێزێك ناتوانێ ببێتە ئاستەنگ لەبەرامبەر پێشکەوتنەکانی PKK, چونکە PKK بۆتە مولکی مرۆڤایەتی. PKK ئامانجی رزگارکردنی سروشت و مرۆڤایەتییە و, جولانەوەیەکە رزگارکردنی سروشتی لەپراکتیکدا سەلماندووە.

سەرۆکی من!

من لەکەسێتی خۆمدا گەلێك چەمکی خراپ و دووری راستینە و پێوانەی PKK بەدی دەکەم. ئەو چەمکانەی لەکەسایەتی مندا دیارن بەگشتی جیاوازیان نییە لەگەڵ راستینەی کوردی کۆن. واتە ئەو هەڵسەنگاندنانەی لەقۆناخی جیاجیادا و بەشێوەیەکی بەرفراوان, سەبارەت بەکەسایەتی " ئامەد " ئەنجامت داوە, ئەوە بۆ منیش راستییەکە, هەر بۆیە ناخوازم دووبارە باسی ئەو چەمك و کێشانە بکەمەوە. ئەو راپۆرتەی بۆ کۆنفرانسم ڕێکردووە تێیدا ئەو شتانەم هەموو روونکردۆتەوە. ئیدی زیاتر لەوەی ئەو کێشانەی کە دەزانرێت بیهێنمە سەر زمان, دەبێ لەبواری پراکتیکیدا پێکی بهێنین. ئێمە تەنیا و تەنیا بەم شێوازە دەتوانین لەشەڕدا سەرکەوتن و لەژیاندا ئازادی راستەقینە بەرجەستە بکەین.

شەهیدان ناخوازن هەر یەك لەئێمە ببینە دیماگۆجێك. بەڵکو دەخوازن کە بەئاخافتنی خۆمان بگەینە کەسێتییەکی زانا و بلیمەت و تێگەیشتوو, واتە کەسێتییەك کە ئاخافتن و پراکتیك ئاوێتەی یەکتری بکات و پێکی بهێنێ. واتا ئەو کەسایەتییانەن کە بەڵێن و چالاکییان یەکانگیرکردووە.

لەدوایین نامەدا کە بۆ هەڤاڵ "سەما "ی بەجێ هێشتووە, سەرنج بۆ سەر ئەو کێشانە رادەکێشێ و دەڵێ: هەڤاڵ " سەما " فەرماندەی منە و لەم چالاکییەمدا سەربازێکی سادەی ژنە کوردی فەرماندە "سەما یوجە"م. سەرباز ناچارە لەچوارچێوەی فەرمانی فەرماندەکەیدا بجوولێتەوە, منیش ناچارم لەفەرمانی هەڤاڵ

" سەما " تێبگەم و پێكی بهێنم. هەر بۆیە ئەم چالاكییە ئەنجام دەدەم, ئەوەی لێی تێگەیشتووم دەربارەی پراكتیكی بكەم. لەو بڕوایەدام كە ئەم ڕێگایە وەها دەكات شایستە بم بە تۆ و شەهیدە قارەمانەكانمان, بەمرەنگە جێبەجێ دەبێ. من بەم چالاكییە, چالاكی هەڤاڵ سەما زیاتر شكۆمەند دەكەم و لەمێشكی دوژمندا وەكو بۆمبایەك دەتەقێمەوە. ))

لێرەدا جیاوازی, قووڵبوون لە تەواوكردنی هەندێك لەو كەموكورتییانەیە كە لەئارادان. دەڵێ:" لەمندا كەموكورتی كەسایەتی پیاو زۆرە " لەڕاستیدا لەسەر بنەمای كەسایەتی " ئامەد ", كە شیمان كردەوە, بیركردنەوە لەپێگەی ئەو كەسایەتییە لەڕێگای چالاكییەكی قارەمانانەی بەمجۆرە و هەروەها پراكتیزەكردنی بەئامادەكارییەكی مەزنەوە, خۆی لەخۆیدا داستانێكە.

هەروەها باس لەوە دەكات كە "لەم چالاكییەمدا سەربازێكی سادەی ژنە كوردی فەرماندە "سەما یوجە"م. ئەمە واتایەكی قووڵی هەیە مەزنایەتیش لێرەدایە. من لەنووسراوەكەی ئەم هەڤاڵەماندا تێدەگەم كە زۆر خوێندەوارە و بۆ ئەم چالاكییەش بەساڵان بیری كردۆتەوە. ئەو بەشێوەیەكی هەڕەمەكی و, بەهەستێكی كاتی ئەم چالاكییەی ئەنجام نەداوە. بەڵكو بەساڵان, ئەو چالاكییە قارەمانانەی كە ئەنجام دراون خوێندۆتەوە و, بەم رەنگە بەباشی چالاكی ئەوانەی لەتوركیا خۆیان سووتاندووە, یان ئەو ژنە خەباتگێڕە بەنرخانەی كە لەچالاكی مانگرتندا شەهیدبوون كاری لێكردووە و, لەكەسایەتی خۆیدا پەسندی كردووە و كاری لێكردووە. هەروەها لەتەواوی شەهیدانی دیكەشمان تێگەیشتووە, بۆیە ئەو هەڤاڵە كەسایەتییەكی ڕۆشنبیرە.

ئەم هەڤاڵە بەهۆی كێشەی چینایەتی, واتا لەئەنجامی كێشە مادديیەكان تەڤلی ئەم چالاكییە نەبووە. بەڵكو تادواڕادە لەسەر بنەمای پرەنسیپی زانستی و باوەڕییەوە وەك پێداویستییەك بۆ بەرجەستەكردنی ئەمانە تەڤل بووە, بەمرەنگە بەپارتی بوونیشی پێكهێناوە. كەسێكی زۆر جیاواز بووە و زیاتریش دەركی بەو مرۆڤە كردووە كە ئێمە هەوڵمانداوە هەڵیبسەنگێنین. باوەڕدەكەم, ئەگەر بەو ئیرادە مەزن و هێزە هزرییەوە بژیابایە, ئەوا یەكێ لەخۆشەویستترین هەڤاڵان دەبوو. خۆزگە بژیابایە و, بمانتوانیبوایە ئەوان پەروەردە بكەین یان ئەگەر بەڕادەیەكی كەمیش بمانتوانیایە هەندێ هەوڵیان بۆ بدەین. وەلێ ئەو خاڵەی كە ئێوە ناتوانن زێدە نرخی بدەنێ ئەمەیە و, ئەمەش زۆر روون و ئاشكرایە.

ئەگەر تائێستا ئێوە كاریگەری چالاكی ئەم هەڤاڵانەتان لەسەر نەبێت, ئەوا پێتان دەڵێم:" نزیكی مەبنەوە ! " چونكە ئەمە لەبەرامبەر راستینەی ئێمە دەبێتە بێ ڕێزی. سەیر بكەن" دەڵێن: "ئەگەر ئێمە لەدەرەوە بووینایە... " لەو بڕوایەدام ئەگەر ئەمەیان بۆ فەراهەم ببوایە پێداویستی باشترین كەسێتی فەرماندەیان لەهەر شەڕێك, لەهەر خەباتێكدا جێبەجێ دەكرد. ئەمە پێكهێنانێكی گەلێك مەزنە, بۆیە ئێمە ناچارین ئەمە بە بنەما وەربگرین. بۆ ئەوانەی لەدوای ئەوانەوەن دەڵێن:" بەڕەخنە لەخۆ گرتنێكی ساختە, تەنانەت بەو شێوازە كەسایەتییەی ژن و پیاو كە دوژمن پشتی پێبەستووە ناتوانین بەردەوام بكەین ".

لێرەدا, واتای ئەم دوو شەهید بوونە دەردەکەوێتەڕوو. ڕەخنەی زۆر توونیدیان لەئێوە هەیە. پێویستە بەدڵنیاییەوە بەهەندی وەربگرن و جددی نزیکی ئەو ڕەخنانە ببنەوە, منیش لای خۆمەوە بیرەوەری ئەو هەڤاڵانە بەرز و پیرۆز ڕادەگرم و هیوا و داخوازییەکانیان جێبەجێ دەکەم.

لەڕاپۆرتی سیاسی سەرۆکایەتی بۆ کۆنگرەی دووەمی **PJKK**, وەرگیراوە

## جولاّنەوەی ژنان

## جولاّنەوەی ئاشتی و دیموکراسییە

جولاّنەوەی ژنان جولاّنەوەی ئاشتی و دیموکراسییە" جولاّنـەوەی دەرخسـتن و رزگـارکردنی شـەڕە لـەبیّ واتایی و حەرامی و لەهەمانکاتدا لەهەموو ئان و ساتێکدا جولاّنەوەی بانگەوازیکردنی شەڕە.

کێشەی ژنان کە بەردەوام دواخراوە پێویست دەکات بەر لەتەواوی کێشەکانی دیکە تـاوتویّ بکرێـت, مـن هەولّم دا تا رادەیەك ئەمە ئەنجام بدەم و بێگومان بەشێوەیەکی رۆژانـەش بـەرەو پێشـەوەی دەبـەم. لێـرەدا دەخوازم ئەم مەسەلەیە روونبکەمەوە, واتە پێویست دەکات سەرەتا ژنان رزگار بکرێن. ئەگەر سـەرەتا ژنـان رزگاریان نەبێت, ناشیّ ئەو پیاوەی کـە لـەخۆی رازییـە و خـۆی بەپێشـکەوتوو لەقەڵـەم دەدات لـەبوارەکانی چینایەتی و سیاسـی و نەتـەوەیی و جڤـاکی و کولتـووری و... هتـد ئاسـتێکی رزگـاری بـەدیبێنێت, ئەمـەش ئەنجامێکە پێیگەیشتووم. کاتێك شیکردنەوە و لێکەڕینم سـەبارەت بەلایـەنی سۆسـیۆلۆژی کۆمـەڵگای کـورد کرد بەو ئەنجامە گەیشتم کەسەرەتای هەنگاونان و دەستپێکردن لەمەسـەلەی ژنـەوە واتـادارترە و لـەجێگای خۆیدا دەبێت. ئەمەش لەنزیکەوە پەیوەندی بەو شەڕە مەزنەوە هەیە کە من بەڕێوەی دەبەم, پێویستە ئـەم تێکۆشانە وەکو بیرۆکە و تیۆریەك نەبینرێت. کاتێك خواسـتم وەڵامێکـی قـوولّ بـۆ ئـەم پرسـیارانە بدەمـەوە کەبۆچی شـەڕ بەشـێوەیەکی هەمەلایـەنی پێشـنەکەوت, بەتایبـەتیش بۆچـی زەمینـەی نێـو خـودی رێکخـراو پێشـنەکەوت, تەنانـەت کەسـایەتی بـەهێز ئـاوا نابێـت و کەسـایەتی سیاسـی و فەرمانـدەی سـەربازی مـەزن پێناگات؟ لەئەنجامدا بۆم دەرکەوت کە پێویستە سەرەتا ژنان رزگاریان ببێـت. جولاّنـەوەی رزگـاری ژنـانیش بەرهەمێکی ئەم بیر و بۆچوونەیە و ئەو واتایە دەبەخشێت. لەنێو ئەو تێکۆشانەی ئێمـەدا زۆر بەباشـی واتـای دروشمی " سەرەتا لەژنان بدەن" ئاشکرابووە. کاتێك سەرەتا لەژنانت دا تـەواوی کۆمـەڵگا بـەدیل دەگریـت. کاتێکیش بڵێیت سەرەتا ژنان رزگار بکـەن ئـەو کاتـە لەهەسـتیارترین و سـەرەکیترین خاڵـدا کۆمـەڵگا بـەرەو رزگـاری راکـێش دەکـەیت. لەڕاسـتیدا بیرۆکەیـەکی زۆر گرنگـە, بـەڵام ئێمـە وەڵامێکـی پێویسـت و گرنگمـان نەداوەتەوە. بەتایبەتی من گوێم لـەم زاراوەیـە نـەبووە بـەڵکو لەئـەنجامی خـەبات و تێکۆشـاندا پێیگەیشـتم" سەرەتا رزگاری ژنان پێویستە, بەتایبەتیش پێویستە لەژێر دەستی پیاوان رزگاریان بێت. دەشیّ ئەمە گەلێك

ئـەنجامی هێـزا و گـرنگ لەگـەڵ خۆیـدا بێنێتـە ئـاراوە. ئێسـتاش ئەمـە تێکۆشـانێکە هـەم لەچوارچـێوەی شیکردنەوە و پراکتیزەکردنیشـدا بـەڕێوە دەچـێت. بەشـێوەیەکی رۆژانـە خـەریکی ئـەم کـارەین. سـەبارەت بەژنان و پیاوانیش گەلێك مەسەلە هەن جێگای ئاماژەپێکردن و باسکردنن.

لەو باوەڕەدام پێویست دەکات ئاماژە بەهەندێك خاڵ بکەم کە پەیوەنـدییان بەخۆمـەوە هەیـە" هـەروەکو دیـارە CIA و MIT سـەبارەت بـە مەسـەلەی سـەرۆکایەتی و ژن گـەلێك شـتی هەڵبەسـتراو و نابـەجێ و دیمـاگۆجی لـەناو کۆمـەڵگادا بڵاودەکەنـەوە و دەخـوازن مەسـەلەکان چەواشـە بکـەن. منـیش ئـەم دەرفەتـە هەڵدەسەنگێنم و هەوڵدەدەم زۆر بەباشی ئەو مەسەلەیە روون بکەمەوە, هێزی ئەمـە لەخۆمـدا دەبیـنم و زۆر سوودمەندیشـی دەبیـنم. سـەرۆکایەتی ( لەوانەیـە لێـرەدا مـن نوێنەرایـەتی بکـەم ) لەڕاسـتیدا لێـرەدا لەچوارچـێوەی هێـز و توانـای تاکـە کەسـێکدا نـاتوانرێ گوزارشـت لەسـەرۆکایەتی بکرێـت و بـەڵکو واتـای بەدەزگابوون لەخۆیەوە دەگرێت و لەو باوەڕەدام کە پێویستە زۆر بەباشی بیری لێبکەینەوە و لێـی تێبگـەین ــ بێگومـان مەودایـەکیش لـەم بـوارەدا بـەدیهاتووە و پێویسـتی بەتێگەیشـتن هەیـە. بـەڵام بێگومـان وەکـو کەسایەتییەك کە نوێنەرایەتی ئەم دەزگایە دەکات, گەلێك پێشکەوتنی گرنگمان لەبواری چۆنێتی ژیان لەگەڵ ژنان بەدیهێناوە. هەوڵدەدەین ئەم ئاستە لەناو تـەواوی گۆڕەپانـەکانی تێکۆشـان و لـەبواری زاراوە و ئاسـتی رێکخسـتندا پێشـبخەین. ئـەنجامی کـە بەدەسـتمان هێنـاوە ئەوەیـە کـە جـەختی لەسـەر دەکەینـەوە. واتـە بەپێچەوانەی ئەم لێکدانەوانەی کە دەکرێت, رزگاری ژنان دەکەوێتە پێش رزگاری تەواوی لایەنەکانی دیکە و, نەك هەر تەنیا رزگاری" بەڵکو خولقاندن و بەدەست هێنانی ژیانەوە گرنگیەکی مەزن لەخۆوە دەگرێت. ئەگەر کـەمێك ئـاوڕ لـەقوڵایی مێـژوو بدەینـەوە دەبیـنین کـە مەسـەلەی کـەوتن و بچـووککرنەوەی ژنـان بەتـەواوی مەسەلەیەکی کۆمەڵایەتی و سیاسییە و یەکـەمین چینە کـە چەوسـێنراوەتەوە و سـتەمی لێکـراوە و تـەواوی ریزبەنـدی چـینایەتی ــ دەوڵـەت, هونـەر, یاسـا, ئـابووریش لەسـەرووی ئەمانـە ــ دژ بـە بەرژەوەندیـەکانی رەگەزی ژنان رێکخراوە و ئاواکراوە و لەهەر شوێنێك ئاستی چەوساندنەوەی ژنان ئاستی چەوساندنەوەی ئەم کۆمەڵگایە دیاری دەکات. هەمان شت بۆ مەسـەلەی رزگاربوونیشـی راسـتە و لـەجێگای خۆیدایە. دەتـوانین بڵێین ژنێك تا چ رادە و ئاستێك ئازاد بێت, ئەوا ئەو چـین و رەگـەز و گـەل و نەتەوەیـەی جێگـای خـۆی تێـدا دەگرێت هێندە ئازادە. ئێمە هەوڵماندا بەشێوەیەکی قووڵ و بەرفراوان وەڵامی ئـەم پرسـە روون بکەینـەوە و بێگومان تێکۆشانی ژنان تەنیا تێکۆشانی ئازادی رەگەزێك نییە. لەسەربنەمای کۆمەڵگا" تێکۆشانێکە لایـەنی یەکسانی و ئازادی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و تەنانەت ئاستی سەربازی خۆی هەیە و مسـۆگەر پێویسـتە وەك تێکۆشانێك دەرکی پێبکرێت کە هەموو لایەنی دیالێکتیکی لەخۆوە دەگرێت. ئەگەر بێتو بەشێوەیەکی راسـت دەرك بەم تێکۆشانە بکرێت, ئەوا بەئەندازەی گەیشتن بە چەمکێکی سۆسیالیستی راست بـەگوێرەی زانسـتی سایکۆلۆژیش رێگا لەپێش رزگاربوون لەتەواوی نەخۆشی و فشـار و چەوسـانەوە دەکاتـەوە و پێشـکەوتنێکی بـەرفراوان لـەبواری ژیـانی ئـازاد بەدیـدێت. کێشـەکە تـا ئـەم ئاسـتە گرنگـە. وابـزانم گـەورەترین نـەزانی و پاشکەوتوویی لەم بوارەدا لەئارادایە. بەڵام لەهەمان کاتـدا لـەو شـوێنەی نـەزانی و پاشـکەوتوویی تێـدا بێـت بەکاربردنێکی مەزن لەئارادایە. لەئایدیۆلۆگەکان و سیاسەتمەدار و پیاوە هەرە لەپێشینەکانی تورکیا تـاوەکو

هونەرمەندان و هێزە سەربازی و شارەزایە ئەخلاقیەكان هەر هەموویان لەبن چەواشەكاریەكدان و سەبارەت بەم مەسەلەیە گەورەترین كۆیلایەتی و فشار بەشێوەیەكی سیستەمكراو بەڕێوە دەچێت. هەربۆیە هەروەكو مەزەندە دەكرێت ئەم تێكۆشانە هێندە سانایی نییە" پێویستی بەمێشكێكی مەزن هەیە. بەئەندازەی هزرێكی مەزن پێویستی بەهەنگاو هاوێشتنێكی زۆر دلێرانە هەیە. كەسایەتیەكی بەمجۆرە ئاستەمە. بەڵكو ئێمە كەمێك تاقیمان كردەوە. هەروەكو ئاماژەمان پێكرد هۆكاری تاقیكردنەوەی ئێمە پێشگرتنە لەجینۆساید و وەرچەرخانی ئەم ژیانەیە كە لەمردن خراپترە, بۆ ژیانێك كە واتای هەبێت و مرۆڤ بتوانێ تێیدا بژیت. هەربۆیە سەبارەت بەناسنامەی ژنان بەئازایەتی و دلێرانە دەستمان بەتێكۆشانێك كرد. ئێستا هەندێ ئەنجام بەدەست دەهێنرێت.

زۆر بەڕوونی و ئاشكرایی دەڵێم" بەبێ ئەوەی خۆم بەو گوتانە بخەڵتێنم و بڵێم شەرمە و دەبێ سەرۆك بەمجۆرە بێ, دەڵێم دەشێ هەندێك كەس باشتر بیربكەنەوە. بانگەوازی لەڕای گشتی و رووناكبیران دەكەم زیاتر بیر بكەنەوە ! ئیتر لەم قۆناخە هەندێ زاراوە بۆتە بناخەی هزر و بۆچوونمان سەبارەت بە كۆمەڵگای كوردەواری بێت یاخود بۆ تەواوی جیهان ـ بەڵام ئەوەی زیاتر ئێمە پەیوەندیدار دەكات كۆمەڵگای كوردە یەكێك لەمانە" پێویست دەكات بەشێوەیەكی ریشەیی لەڕاستینەی پیاو دابرێت, ئەمەش نەك هەر تەنیا لەبواری رەگەزیدا, بەڵكو پێویست دەكات لەبوارەكانی فەلسەفە و, ئەخلاق و سیاسەت و.. هتد كۆمەڵگا لەژێر كاریگەری پیاودا دەربكەوێت. بۆ ئەوەی هەندێ راستینەی سەرەكی و بنچینەیی بێتە ئاراوە. پێویست دەكات ئەم دابڕانە ریشەیی بێت. هەروەكو لەئەزموونی خۆشماندا دەبینرێت ژنان شانبەشانی ئەم دابڕانە دەبنە خاوەنی تێگەیشتنێكی مەزن. زۆر بەباشی ئەم راستیە دەبینێ كە چۆن ئەو هێزەی لەدەستی پیاودایە لەدژی بەكاردەهێنرێ و تێدەگات. ئەوەی هێزی نەبێت یەكسانی و ئازادیشی نابێت. پێویست دەكات ئەم رێچكەیە بدۆزینەوە كە بیكات بەهێز. ئەمەش پەیوەندی خۆی بەڕاستینەی گەلی كوردەوە هەیە. بەگوێرەی من گەلی كورد رەوشی لەڕەوشی سیستەمی توركیا سەختترە ــ بەتایبەتی ئەوروپاییەكان, ئوسمانیەكان وەكو قامچی بەدەست هەڵدەسەنگێنن ـ دەتوانین رەوشەكەی لەو ژنە بچوێنین كە بەزۆر دراوەتە خراپترین و ستەمكارترین پیاو. راستینەی خودی گەلی كورد بەمجۆرەیە, ئەو سیاسەتەی پەیڕەو كراوە لەو سیاسەتە جیاوازتر نییە كە بەسەر ژنان پیادە دەكرێت. بێگومان یەكێك لەم هۆكارانەی ئێمەی بەرەو تێكۆشانێكی بەمجۆرە برد ئەمەیە. كاتێك لەم خاڵەدا مەسەلەی ژن تاوتوێ بكەین لەڕاستیدا دەبینین كە رێچكەی بەهێزبوون بەدابڕاندا دەرباز دەبێت. لەپێناو یەكسانی و یەكێتییەكی ئازادانە باس لەدابڕان دەكەم. لێرەدا تەنیا باس لەنزیكبوون و لەهەڵوێستێكی تەكتیكی ناكەین. ئیتر بۆ ئەوەی ئەم دابڕانە هەم لەبواری سۆسیۆلۆژی و سیاسییەوە پێشكەوتنێك بەدی بێنێت پێویست دەكات ماوە و شێوازی ئەم دابڕانە بەشێوەیەكی بەرجەستە دیاری بكەین و ناتوانین لەئەنجامدانی دابڕانێكی جددی خۆمان بەلاوە بنێین. ئێستا هەندێ كەس دەڵێن" ئایا خۆی چۆن لەگەڵ ژناندا دەژی؟ نەخێر! لەژیان لەگەڵ ژنان زیاتر تێكۆشانێكم دەرهەق بەچۆنیەتی ژیان لەگەڵ ژنان هەیە. بەگوێرەی من ئەمە دەبێتە شەڕێكی سەخت و بێ بەزەییانە. یەكێك لەو شەڕە سەختانەیە كە پیادەی دەكەین. ئەگەر باس لەكەسایەتی خۆم بكەم دەڵێم ناتوانرێ لەگەڵ

ئەو ژنەدا بژین کە لەئاستی ئەمڕۆماندایە, کاتێك وەکو کەسایەتیەکی سیاسی و تەنانەت وەکو کەسایەتیەکی سەربازی باس لەخۆم بکەم, بەمانای ( کلاسیکی هەروەکو لەکۆمەڵگادا دەبینرێ) هەوڵبدەم لەگەڵ ژنێکدا بژیم ناتوانم سەرۆکایەتی نەتەوە بکەم, لەوانەیە بپرسن و بڵێن بۆچی؟ لەبەرئەمە“ ژنێك لەئاستێکی بەرزدا پێشکەوتنی بەدی نەهێنابێ, ئەوا رۆژانە بەچەکوش لەهزر و دڵم ئەدات, بەکاری زۆر بچووکەوە خەریکم دەکات. ئەگەر سەرۆکێکی نەتەوەیی, تەنانەت سەرۆکێکی سۆسیالیستی خۆی رووبەڕووی کێشە جددیەکانی ئازادی ببینێتەوە, مسۆگەر ناچارە ژنێکی بەهێز لەبەرامبەر خۆیدا ببینێ. لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا رەوشی موڵکایەتی تایبەتی ژنان و خۆ نیشاندانی وەکو ناسکترین کاڵای سیستەم رێگا لەبەردەم شەڕێکی دژواردا دەکاتەوە, یاخود هەروەکو لەنێو کۆمەڵگادا گوتەیەکی بەناوبانگ هەیە کە دەڵێن ژنێك لەپشتی هەر سەرۆکێکدا هەیە, بەڵام ژنێکی چۆن؟ پیاوەکەی دەداتە پێش و خۆیشی بەشاراوەیی لەتاریکیدا دەمێنێ. پیاو دەبێتە سەرۆك, بەڵام بەخۆشی بەگرگنی دەمێنێتەوە. من ئەوە شایانی خۆم نابینم. من نەفرەت لەو زاراوەیە دەکەم کە ژنێك لەپشتمەوە بێت یاخود من بەرەو پێشەوە ببات. ئەگەر ژن پێشبکەوێت دەبێ شان بەشانی پیاو یاخود دەبێت لەپێشەوە بێت. چەمکێکی بەمجۆرە هەیە, لەمیانی ئەو رەوشەی لەئارادایە ناشێ مرۆڤ نەترسێ, لێرەدا هزرێکی بەمجۆرە نییە کە ژن بەخراپەکار نیشانبدەم, بەڵام ریاکاری ژن جێگای باسە. ئەو پێوانانەی نرخ و بەهای پێدەدات تا دواڕادە لەسیاسەت, سەربازی, ئازادی و بەهاکانی ژیان دوورە. هیچ ئەنجامێك لەمە بەدەست ناهێنین. دەتوانم گەلێك نموونەی مێژوویی بهێنمەوە. بۆنموونە“ ستالین سەرۆکایەتیەکی بەکاریگەرە, بەڵام ئەو ژنەی لەگەڵیدا دەژیا ناچاربوو خۆی بکوژێ, واتە بەرگەی ئەم ژیانەی نەگرت. لەتورکیاشدا سەربازەکانی تورکیا و تەنانەت مستەفا کەمالیش مەسەلەی ژنهێنان و پێکەوەنانی خێزانیان بەبنەما گرتووە, هەندێ ژن لەچواردەوری مستەفا کەمال هەبوو, واتە سنوورداری ئاستی ئازادی ئەم ژنانە و هێزە مەزنەکەی مستەفا کەمال ئەم ژنانەی کردووە بەبوونەوەرێکی بچووك و بێ بنگە و لاسایی کەرەوە. خواستوویەتی خێزان پێکەوە بنێ, ژنێکی زۆر ترسناك هاتۆتە ئاراوە, بۆیە نەیخواستوە لەگەڵیدا و لەدەورووبەریدا بژین. تەنانەت سنووری ئەو ژنانەیان تێپەڕنەکردووە کە بۆ رابواردن بەکار دەهێنرێن. تاوەکو ئێستا ژنێکی خاوەن هێز لەناو کۆمەڵگای تورکیا دەرنەکەوتووە. لەکۆمەڵگاکانی دیکەش کەم — زۆر بەمجۆرەیە. ئەگەر بخوازین لەنێو کۆمەڵگای خۆرهەڵاتی ناویندا دووچاری هەمان مەترسی نەبینەوە پێویستە هەندێ تەگبیر وەربگرین. بەشێوەیەکی بەرجەستە ئەم تەگبیرە وەکو جوڵانەوەی رزگاری ژنان رووبەڕوومان دەبێتەوە. رەوشتی من بەمجۆرەیە, بەگوێرەی من کاتێك دەڵێین ژیان, هەندێ کەس ئەمە بەڕاست و دروستی تێناگەن. مەسەلەکە تەنیا ئەوە نییە کە ژیانێکی لەبواری زایەندیدا بێت, لەڕاستیدا بینین و بەدەستەوەگرتنی ژنان وەکو رەگەزێك, نزیکبوون و هەڵوێستێکی بچوککەرەوەیە, باس لەهاوبەشێتی و دابەشکردنێکی هەمەلایەنە دەکەم, بێگومان ئەمە پێداویستییەکی یەکسانییە, مسۆگەر سۆسیالیزم پێویستی بەمە هەیە. ئەگەر دوور لەفشار و چەوسانەوە باس لەپەیوەندییەك بکەین, ئەگەر بڵێین مرۆڤ بناخەی سەرەکییە, مسۆگەر پێویست دەکات تاك سەبارەت بەناسنامەی خۆی خاوەنی بڕیار بێت. پێویستە خاوەنی پێوانەکانی رازی بوون و رەتکردن و پەسندکردن بێت, هەربۆیەش پێویست دەکات کەمێك بەهێز بێت. واتە ئەگەر

بەتـەواوی بێهێـز بـێ و پیاوەکـەی بەرامبەریشـی تـادوا رادە بـەهێز بێـت, بێگومـان لەڕەوشـێکی بـەمجۆرەدا شێوەی ژنێکی وابەستە دێتە ئاراوە. پێویستە زۆر بەباشی ئەمە ببینرێت. ئێستا پیاو لەهـەموو کاتێـك زیـاتر هەموو شتێك بۆ خۆی رەوا دەبینێ. ژن سەبارەت بەهەموو لایەنەکانی بەدەستهێنان, رشتە و مسـۆگەر رێگـە بەشتێکی بەمجۆرە نادات. دەشێ پیاو وەکو خۆشەویسـتێکی کـوێر بێـت و بڵـێ بەهایـەکی زۆرت پێـدەدەم. بەڵام کاتێك مەسەلەی دابەشکردنێکی یەکسانی هێز و بڕیاردان ببێتە جێگای باس, ئەوا کوێرانەترین ئاشـق ( پیاو ) دەبێتە سەرەڕۆییەك. لەلایەنی خۆمەوە ناچارم ئەمانە لەبەرچاو بگرم, ناچارم جەخت لەسەر بەپتەوی هێشتنەوەی بەها مۆراڵیەکانم و پاراستنی پێکهاتەیەکی پتەو و دروستی ئـەخلاقی بکەمـەوە. ئاسـتی ئـازادی رەگەزی ژنان بۆ من گرنگە. بۆ ئەوەی مـن ژنـان پەسـند بکـەم پێویسـت دەکـات لەئاسـتی نەتەوەییـدا بـبن بەخاوەنی ناسنامەیەك. ئەمە چ واتایەك دەبەخشێ؟ ئەمـە پێویسـتی بـە شـکۆمەندی و قەڵـەمبازێکی گشـتی هەیە. هەروەکو چۆن پێویستە لەبواری دەرك پێکردن و ئیرادە بەمجۆرە بێت, ئەوا پێویست دەکات ژن لەناو رێکخستن و زۆربەی گۆڕەپان و زەمینـەکانی تێکۆشـاندا هـەبوونی خـۆی نیشـانبدات و بیسـەلمێنێ. ئەگـەرنا بـەهێزبوون بەدینایـەت. ژنێکـی لاسـایی و دروسـتکراویان دەرخسـتۆتە پـێش و کردوویانەتـە بەرپرسـیاری دەزگایەك و گوتویانە تۆ سەرۆکی, وەزیری, پەرلەمانتاری, ژن بەمجۆرە بەهێز نابێت. پێویسـتە بـەهێزبوونی ژنان لەئازادی هەمەلایەنی رەگەزدا ببینرێت, تەنیا باس لەبەهێزبوونی سیاسی ناکەم پێویستە خاوەنی پێوانە و تەنانەت سیستەمی سیاسی بەمجۆرەبن کە پیاوێك نەتوانێ لەسەربنەمای هێز و سەرمایەی خۆی هەڵسـێ و ژنێك بخوازێت و وەکو چۆن دەیەوێت بەکاری بێنێت. پێویسـت دەکـات بەتـەواوەتی ئـەم دەرفەتـە لەدەسـت پیاوەوە دەربخرێت, پێویستی بەپرەنسیپی مۆراڵ هەیـە. بـۆ نموونـە ئەگـەر پیاوێـك بخـوازێ لەگـەڵ ژنێکـدا بژیت, پێویست دەکات رێکخراوی ژن یاخود راستینەی ژیـانی نـوێی ژنـانی پیشـان بـدرێت. مـن فشـار پیـادە ناکەم و پشت بەهێزی ئابووریشم نابەستم. تەنیا و تەنیا دەبێ لەبواری ژیان, لەئاشتیشەوە بگرە تـا دەگاتـە سیاسەت, لەبڕیارەکانی ژیانی ئابووریەوە تاوەکو دەگاتـە مەسـەلەی خاوەنـدارێتی منـاڵان و ژیـانی زایەنـدی پێویست دەکات لەسەربنەمای ژیانێکی رۆژانە خاوەنی بڕیاری هاوبەش بن. واتە مسۆگەر دەبێ ئـەوە بەسـەر ئەم پیاوەدا بسەپێنێ کەنابێ بەسەر ژندا زاڵ و باڵادەست بێت, چونکە بـەم شـێوەیە پەسـند نـەکرێت, ئـەوا پیاو بەپشتبەستن بەوهێزەی هەیەتی هەموو کاتێك خـۆی دەسـەپێنێ. پەرێشـانی و ئـەو کەوتنـە ترسـناکەی بەسەدان ساڵە هەیە لەسەر ئەم بنەمایە هاتۆتە ئاراوە, پێویستە ئەم رەوشە بەتـەواوی پێچـەوانە بکرێتـەوە. ئێستا منیش دەڵێم ئەمە زۆر ئاستەمە, لەوانەیـە بڵـێین" چـی پێویسـت دەکـات دەخـوازین بـژین. ئەگـەر ژن کەمێك ملکەچی بکات چـی دەبێـت, ئایـا خۆشـتر و باشـتر نابێـت؟ بـەگوێرەی مـن, هەرچـۆنێکی بێـت ئـەوە بەفاشیزم دەگات. ئەمە بەدڕەوشتییە.بێگومان ژن وەڵامێکی زۆر گڵاوی هەیە. بیداتە ئەم رەوشـە. ئەمەیـە" ئەمەش ئەنجامێکە بەگوێرەی سۆسیۆلۆژیا و سایکۆلۆژیا و تێڕوانینـەکانی خـۆم پێگەیشـتوم, لێـرەدا ژن زۆر بەخراپی وەڵام دەداتەوە ئەگەر تۆ بەشێوەیەکی زۆر توند و رەها ئەو بخەیتە ژێـر فشـاری زایەنـدی, ئـەویش بەشێوازێکی زۆر رەها مەسەلەی سێکسـی وەکـو چـەکێك بـەکار دێـنێ. ئەمـە لـەنێو کۆمـەڵگای کوردەواریـدا رێگای لەبەردەم کەوتنێکی خراپ کردۆتەوە. دوای ئەوەی ژن بەشێوەیەکی زۆر رەها خۆی کـرد بـەئامرازێکی

زایەندی و شێوازێکی ئامرازی بەرهەمهێنان و پێوانەیەکی ئەخلاقی کرد بەیاسا و زاراوە, ناشێ کۆمەڵگای کورد چاك (إصلاح) بکرێت. لێرەدا تەنیا بەکەوتن و ئاستی نزم و بچووکی خۆی ناوەستێ. نەتەوە لەنەتەوایەتی خۆی بەدەر دەبێت, ئێستا فەرمانداریێتی و سەرۆکایەتی لەناو ئێمەدا دەردەکەوێت. لەناو پارتیماندا بەتایبەتیش لەنێو ریزەکانی شەڕدا پیاوێکی جددیمان نەبینی. ناتوانین لەم ژیانە رزگاریان بکەین کە لەپێناو ئامانجی تەسك و بچووك پیادەی دەکەن. بێگومان کاتێك پشت بەم گەوهەرە ببەستیت ئەنجام ئایدیۆلۆژیای بنەماڵێتی یە. ژنێکی بەهێز و ئەنجامگیر, یان هەموو شتێکی لەپێناو پیاوێك بەخت دەکات یاخود لەپێناو ئامانجێکی سەرەکی و مێژوویی هەموو شتێکی خۆی بەلاوە دەنێت. ئەمە رەوشتێکی زۆر خراپە, پێویستە نەهێڵدرێ.

ئەو ئەنجامەی لەم خاڵەوە بۆ کۆمەڵگای کوردم هەڵهێنجاوە" پێویست دەکات لەموڵکایەتی تایبەتی هەنگاو بۆ کۆمەڵکاری و موڵکایەتی گشتی بهاوێشترێت. پێویستە ژن لەرەوشێکی بەمجۆرە رزگاری بێت کە وەکو ئامرازێکی تایبەتی ئارەزووەکان بەکاردەهێنرێت, پێویست دەکات بەتەواوی بیگەیەنینە ئاستی نەتەوەیی و هەڵوێست و رەوشتی نوێی ئازادی و رێکخستن و بەرژەوەندیەکانی گشتی کۆمەڵگا. ناشێ بەشێوەیەکی تر لەم نەخۆشییە رزگارمان ببێ کە وەکو شێرپەنجەیە و تەنانەت مەترسیدارتریشە, لەسەر ئەم بنەمایەش جوڵانەوەی ئازادی ژنانمان هێنایە ئاراوە. ئێستاش هەندێ پیاو لەنێو ریزەکانی پارتیماندا هەن دەڵێن لەڕابردوو کاتێ ئێمە شەڕمان دەکرد و تفەنگمان دەتەقاند, ژنەکانمان فیشەکیان بۆ دەهێنایـن, من نەفرەت لەوە دەکەم, بۆچی تۆ تفەنگ بتەقێنیت و ژنیش تەنیا فیشەکت بۆ بێنێ؟ ئەگەر بەگوێرەی فەرماندە و شەرڤانەکانمان بێت, ئەو کارەی ژنان بیکەن تەنیا گواستنەوەی فیشەك و تەقەمەنییە. لێرەدا نایەکسانیەك لەئارادایە. ئەمە لەتەواوی مەسەلەکاندا بەمجۆرەیە. ئەو رۆڵەی بۆ ژنان تەرخانکراوە بەردەوام گوتوویانە تۆ یارمەتی بدە, با پیاویش بەسەر تۆدا زاڵ و باڵادەست بێت. ئەمە لەتەواوی کۆمەڵگاکانی چینایەتی بەمجۆرە دەستپێدەکات, تەواوی چەوساندنەوەکانی ژنان بەم شێوەیە لەمێژوودا دەستیپێکردووە. تاکو ئێستاش بەشێوەیەکی چڕ و پڕ بەمجۆرەیە.سەرەڕای ئەوەی دەڵێین ئێمە پارتی ئازادین" لێرەشدا دەخوازن ئەمە پەیڕەو بکەن. دەڵێن لەجیاتی ئەوەی ژنان بەسەربەخۆیی بمێنن, با بێن لەژێر بەڕێوەبەرایەتی ئێمەدا جێگای خۆیان بگرن. ئیتر هێندە ماوە بڵێن تەواوی فەرمانداریێتییەکان هی پیاوانن, کارگێڕیەکان هی پیاوانن. واتە لەشیکردنەوە و هەڵسەنگاندنی دواییدا مسۆگەر دوا ئاخافتن هی پیاوە و هی ژن نییە. بێگومان ئێمە لەم لایەنەشەوە نوێکاریمان ئەنجامدا, بەخۆم خولقاندم. ئەگەر هەبوونت هەیە ئەو کاتە نابێتە ژنێك کە تەواو لەژێر باڵادەستی مندا بیت. هەڵبەتە دەرهەق بەڕەوشتی خۆم ئەمە وەکو بێ رەوشتی دەبینم. هێندەی دەتوانێ خۆی بەڕێوە ببات بابەڕێوەببات, هێندەی دەتوانێ با وشیار بێتەوە و ئاستی تێگەیشتنی خۆی بەرزبکاتەوە و هێزی خۆی دەربخاتە مەیدان. بۆچی لەمە دەترسێین, ئەویش مرۆڤ نییە؟ ئەگەر وایە, ئەو کاتە پێویست ناکات لەبەهێزبوونی بترسین. نەك لەژێر باڵادەستی من, بەڵکو با لەپێناو ئازادی خۆی, تاوەکو دوایی لەچیاکان لەگەڵ چەکەکەی بخەوێ, هەڵسێ, بەڕێوە بچێ و بازبدات.

بەکورتی ئێستا لێپرسینەوە سەبارەت بەمە دەکەم. کاتێك لەیەکینەکانی ژنان پرس دەکەم و دەڵێم چۆنن" دەڵێن بەشێوەیەك ئاستی تێگەیشتنمان بەرز دەبێتەوە کە باوەڕ ناکرێت, مسۆگەر پێویست دەکات سەبارەت بەم مەسەلەیە قووڵ بینەوە, تاوەکو ئێستا تێنەگەیشتبووین کە پیاو بەم شێوەیەیە. بێگومان هەر لەئێستاوە ئەمە ڕێگا لەپێش ئاستێکی مەزنی دەرك پێکردن کردۆتەوە و پێناسەکردنی ڕەگەزی بەشێوەیەکی دروست لەناوخۆیدا هێناوەتە ئاراوە و گەیاندویەتی بەناسنامەیەکی نوێ. دەخوازم بڵێم هەنگاوێکی سەرەتایی و بچووکە. شیمانەی هەیە ئەمە ڕەنگدانەوەی خۆی بەسەر تەواوی کۆمەڵگادا بکات. لەوانەیە لێرەدا بڵێن ئەمە کە پەیوەندییەکی بەمنەوە هەیە, پەیوەندیەکەی ئەمەیە کە باسمان کرد. لەپشت هەرکەسێکدا ژنێك هەیە, بەمجۆرە لەگەڵیدا دەژی یاخود پشت بەژنێك دەبەستێ و بەمجۆرە دەژیت. ئێمەش لەمیانی پشت بەستن بەجوڵانەوەی ئازادی ژنان, پێویست دەکات هێزی ژیان بەدیبێنین و ژیان لەبەرچاو بگرین. وابزانم سۆسیۆلۆگەکانی وەکو " بێشکچی " باشتر لەمە تێدەگەن. واتە زۆر لەرۆشنبیرەکانمان هێندە پەرێشانن بەداخەوە ناتوانن هزرێك بئافرێنن. بەشتی چەوتەوە خەریکن" کاتێك باس لەچۆنیەتی ژیان لەگەڵ ژنان دەکەیت, بەخەوتن و هەڵسان تێدەگات. ئەمانە نزیکبوونەوەی زۆر هەرزانن. ژیان لەگەڵ ژنان پێویستە تاڕادەیەك لەمیانی هزری مەزن بێت. پێویستە پەیوەندی بەپێشکەوتنی سۆز و ئیرادە و شکۆمەندیەوە هەبێت. زۆر بەڕاشکاوی دەیڵێم و هیچ شەرمیش نییە" لەو ڕەوشەی ئێستا کە ژن تێیدایە, خەوتن لەگەڵ ژنێکدا بۆ من زۆر سەختە. هەندێ ساختەکار ئەمە بەچەواشەکارییەوە هەڵدەسەنگێنن, بەڵام لەڕاستیدا بەمجۆرە سەختە. ئەم سەختی و ئاستەم بوونەش پەیوەندی خۆی بەمۆراڵ و پرەنسیپەوە هەیە. لەم بارەیەوە هەر پیاوێکی کورد یان ژنێکی کورد بخە سەر پێخەف ــ لەزۆربەی کۆمەڵگاکاندا بەمجۆرەیە ــ تاوەکو بەیانی وەکو لاشەیەکی مردوویان لێدێت. بۆچی؟ چونکە شێوازی پەیوەندییان وابەستەی پرەنسیپ و مۆراڵێکی بەرز نییە. گرێدانی بەڕەفێکەوە هەیە. بێگومان ئەم پەیوەندییەیان لەسەر بنەمای ڕاکردن لەبەها نەتەوەیی و کۆمەڵایەتییەکانە. من لێرەدا خەوتن بەتاوان دانانێم, کەس ئەمە بەهەڵە تێنەگات. بەڵام کاتێك باس لەکۆمەڵگای کوردەواری دەکەین دەبینین لەواقیعی کۆمەڵگاکەماندا پەیوەندییەکان لەسەربنەمای ئامانجی جددی نەتەوەیی و بەهاکانی ئازادی کۆمەڵگا نییە, بەڵکو بەگوێرەی فەلسەفەی" "لەسەداسەد تۆ هی منی, منیش هی تۆم, " لەسەر بنەمای ئامانجی بچووك بەسەر یەکتریدا داخراون. لێرەدا هیچ شتێك لەپەیوەندیەکی بەمجۆرەی نێوان ژن ـ پیاو ئەنجامگیر نابێت. ئیتر بەمە بڵێین خێزان, ژن یاخود فلان دەزگا یان پەیوەندی ژن ـ مێردایەتی, لێرەدا هەموو شتێك بوو بگرێ. ژیانی نەتەوەیی و ئاستێکی بەرزی ژیانی کۆمەڵایەتی کۆتاییان پێهات. بۆ ڕێکخستن ئیتر خۆدانە پێش و بینینی ئاسۆی داهاتوو, هزری پێشکەوتوو کۆتاییان پێهات.

تەواوی ئەمانە بەبچووکی و هەرزانی تاوتوێ دەکرێت. واتە تەنیا بۆ ئەوەی بڵێین ئاستی تێگەیشتنی هەیە و چەند زاراوەیەکی بێ ناوەڕۆك فێر دەبێت, دەبێتە خاوەنی زانیاریەکی بێناوەڕۆك. بەڵام لەڕاستیدا هیچ شتێك لەئارادا نییە, چونکە پێویست دەکات ئیتر لەبواری ژیاندا پراکتیزەی بکات. لەلام شەرمە ئەگەر پرسیارێکی بەمجۆرە پێشبکەوێت و بڵێن: ئەم ژنانە دەبنە هی کێ؟ ژنانی وڵات و جوڵانەوەی ئازادین,

ئەمانە ژنانی پیرۆزی و شکۆمەندین. هی ئەم پیاو یا ئەو پیاو نییە, تەنانەت هی منیش نیین. ئەمانە ژنانی ئازادین! ئەمانە ژنی شەهیدانن, ئەمانەش سەلمێنراون. ئازایەتی و فیداکارییەکەیان وانیشاندەدات کە شایستەیان دەبن. ئێستا باس لەخۆشەویستی دەکرێت. ئەو ژنەی کە جێگای خۆشەویستییە، واتە ئەو ژنەی تاڕادەیەك لەسەر ئەم بنەمایە ئافرێنراوە, لەپێناو گۆشت و ئێسك و رووخسارەکەی جێگای خۆشەویستی نییە. لەبەرئەمەش جێگای خۆشەویستی نییە کە تاچ رادەیەك کۆیلە و موڵکی تۆیە. گەوهەری خۆشەویستی پەیوەندی بە ئازادیەوە هەیە. هەرلە کام لایەنەوە تەماشا بکەین دەبینین واتا و گوزارشتی ئازادی لەکۆڵەکەی بەشی شکۆمەندی تەواوی ئەشقەکاندا هەیە. ئەمە دەخولقێنین و بەم شێوازەش دەبێت. شەڕی چەندین ساڵەی ژنان و کچانی کورد لەچیاکان دەبێتە گرنگترین سەرچاوەی خولقاندنی خۆشەویستی. شانبەشانی دابڕان, پیاو لەبەهای ژنان تێدەگات, ئەگەر پیاو زۆر پێویستی بەژن بێت و بیەوێت, ئەوا پێویستە رێزی لێبگرێت و بەهای بزانێ. ئەگەر ژن چاکتر خۆی رێکبخات و خاوەنی نرخ و بەهای مۆراڵی خۆی بێت ئەوکاتە دەڵێ:" ئەگەر دەخوازیت ببیتە هاوبەشی ژیانم پێویستە تا ئەم رادەیە جەنگاوەر بیت, تا ئەم رادەیە گرێدراوی گەل و نەتەوە و مرۆڤایەتی بیت, نابێ فاشیست و فیۆداڵ و نابێت و تفت و تاڵیش بێت," دەبێ بڵێ:" ئەمەیە مەرجەکانم." مەرجەکانی ژیان و دابەشکردنی ژیان لەلایەن ژنان و جولانەوەی ئازادی ژنان بەمجۆرەیە. ئەگەر پیاوێك بڵێت ئەمانە لەخۆمدا بەدیدەکەم, ئەو کاتە پێویست دەکات بیسەلمێنێ, ئەگەر بڵێ بەزەبری چەك و هێز و بەناچاری بۆ خۆمت دەبەم, ئەمە نابێت. بەتەواوەتی پێویستە بەگوێرەی پرەنسیپی ئازادی خۆت بسەلمێنێ. بۆ ژنان هیچ شتێك لەمە بەهادارتر نییە. بەگوێرەی من ئەمە لەپێشەوەی تەواوی کار و خەباتەکانی تر دێت. لەپێشەوەی تەواوی پەیوەندییە سەرەکیەکانی مرۆڤایەتی دێت. هەربۆیە پێویستی سەرخستنی ئەم تێکۆشانەمان بینی. هەروەکو لەکارەکانی دیکەشدا دەرکەوتووە بێگومان لەم خەباتەشدا لەسەربنەمای ئەو پێداویستییە ناچارییەی پراکتیك لەگەڵ خۆیدا هێناوە ئەوا هەروەکو دەزانن و دەیبینن لەبواری تیۆری و سۆسیۆلۆژی و سیاسی و سەربازی لەهەڵوێستەکردندا زەحمەتی نابینم. تەنانەت لەئاستی سۆزداریشدا هەڵوێستەکانم ئاستەم نییە. من ئەمە بۆ هونەرمەندان و پیاوانی زانست بەجێدێڵم. ئاماژە بەوە دەکەم کە پێویستە زۆر بەجددی ئەم مەسەلەیە تاوتوێ بکەن. بەتایبەتی دەڵێم پێویستە وەکو مەسەلەیەکی لەپێشینە هەڵسەنگێنرێ. جوڵانەوەی ئازادی ژنان بەم شێوەیە پەرە دەسێنێ. شانبەشانی هەزاران ملیتان خۆی بەرەو پێشەوە دەچێت, هەموویان شەڕڤانی گیانبازن. ئەمانە لەمیانی قووڵبوونەوەیەکی زیاتر بەردەوام دەبن. لێرەدا جێگای شتێکی لەمجۆرە نییە کە دەڵێ " چەندە من لەراحەتیدا دەژیم". سەما یوجە و زیلانەکان رێبەرایەتی ئەمەیان کردووە. هەزاران شەهید هەن ئەوان ئەمەیان ئەنجامداوە. ئێمە لەیادی ئەواندا بەشێوەیەکی بەرجەستە جوڵانەوەی ئازادی ژنان دەخولقێنین. پیاو سەبارەت بەم بابەتە" ئەگەر دابڕان هەبێت با نەڵێ من بەتەنیا ماومەتەوە. نەخێر لێرەدا پێویست دەکات پیاو خۆی رێکبخات و شێوەیەك بەخۆی بدات, پێویستە بەپرەنسیپ و دڵسۆز و مەرد بێت, پێویستە خۆی بخولقێنێ. بەجۆرێکی دیکە نە لەناو رێکخراوی ژنان و لەناوەوە و دەرەوەی پارتیشمان ناشێ لەگەڵ ژنان بەیەکتر بگەن و ئاوێتە ببن. هەر لەئێستاوە دەڵێن مرۆڤ ناگات بەو ژنانەی کە سەرۆکایەتی PKK

خوڵقاندوویەتی. بێگومان پێی ناگەیت! بۆچی پێی ناگەیت؟ چونکە لەوێدا شکۆمەندی و گرێدان پرەنسیپ لەئارادایە. بۆ ئەوەی تۆ بگەیتە ئەویٚ سەدا سەد پێویستە دروست و دڵسۆز بیت. واتـە سـەرەڕای دڵسـۆزی پێویستە پەیمانت لەگەڵ رزگاری، ئازادی، رێکخستن و چالاکیەکی پتەودا هەبێت. ئەو کاتە دەتوانیت لەگـەڵ پیرۆزی و شکۆمەندی جوڵانەوە و رێکخراوی ئازادی ژنان ئاوێتـە بیت. بەهەسـت و سـۆزی خۆشەویسـتیەوە دەتـوانی تـەڤلی ببیـت. راسـتینەی رێکخـراوی ئـازادی ژنـان بەشـێوەیەکی دیکـە دەرفـەت نـادات. ئەمانـە لەهەمانکاتدا بۆ ژنانیش لەجێگای خۆیدایە. بەجەخت کردنـەوە دەڵـێم ئـەو یەکێتییـەی لەسـەر ئـەم بنەمایـە پێکبێـت، یەکێتیەکـە تێیـدا ناسـنامەی پیـاو پەسـند دەکرێـت. بـەکورتی دەتـوانم بڵـێم رەوشـتی نـویٚ و رێکخستنەوەی نوێی کۆمەڵایەتی لـەم چوارچێوەیەدا پـەرە دەسـێنیٚ. کـەس نـەڵیٚ ئەمـە سـەختە و دژوارە. ئەوەی سەختە کۆیلایەتییە، دەرکەوتنە لەپێوانەکانی مرۆڤ بـوون، سـەخت ئەوەیـە کـە مـرۆڤ لـەنێو تـەواوی جیهاندا ریسوا بێت. ئەوەی جوانە و سانایی یە ئەوەیە کە ئازادە، ئەوەیە کە مرۆڤ بەهێز دەکات. شتی جوان ئەوەیە کە تاك بەهێز بکرێت و لەژیاندا دابەشکردن و هاوبەشێتی پەیڕەو بکات. ئەوەی سانایی یە، ئەوە نییە کە پێویستی بەبیستنی هیواکانیەتی، ئەمە نییە کە پێویستە بەبناخەی دابنێن.

پێویست دەکات مەسەلەی ژن لەپێشەوە بێت، لەجیاتی پرەنسیپی سەرەتا لەژنان بدەن، ئەگەر بگـوتریٚ سەرەتا ژنان رزگار بکەن ئەوە خەباتێکی راست تـرە. لەمـە بـەدواوەش لەوانەیـە نـۆرەی پیـاو بێـت. بـەهیچ جۆرێـك شـەرم نییـە! بـۆ نموونـە لەسـەرووی هـەموو کەسـێکەوە هەوڵـدەدەم خـۆم ئیقنـاع بکـەم. مـن هەڵدەسـەنگێنن و بـەگوێرەی خۆیـان دەڵـێن بـەمجۆرە و یـان بـەم شـێوەیە لەگـەڵ ژنانـدا دەژی. بێگومـان دەخوازم لەگەڵ ژناندا بژیم ئەمەش هیچ شەرم نییە! هەم ماف منە و ئەرکی خۆشمـە. بـەواتای تاکـە کەسـی ئەمە نالێم، تەنانەت هەندیٚ زاراوەمان سەبارەت بەوە پێشخسـت کـە دەخـوازین لەگـەڵ چـۆن ژنێکـدا بـژین. وابزانم ئەمە بۆ هەڤاڵانی پیاو پێوانەیەکە. هەروەها دەڵێن بەم شێوەیە و بەمجۆرە گرێـدراوی سـەرۆکایەتین، بەڵام سەرم سوڕماوە، ئەم سەرۆکایەتییەی پێیـەوە گرێـدراون سـەرۆکایەتییەکی چۆنە؟ هـەروەکو چـۆن لـە تەواوی بوارەکانی دیکەدا دەبیسترێت، سەبارەت بەم بابەتانەش تێکۆشـانێکی هەیـە و پێوانـەی رەتکـردن و پەسـندکردنی هەیـە. چـەمکی ژیـان و فەلسـەفە و رەوشـتی هەیـە. هـیچ یـەکێکیان ئاگـاداری ئەمـە نـین. بەتایبـەتیش لەهــەڤاڵانی پیــاودا، وابــزانم ئــەویش گرێــدانێکی دووڕوویيــە، گرێــدانێکی لاوازی بــەمجۆرە لەئارادایە.ئەگەر بەمجۆرە نەبوایە رێزیان بۆ تەواوی ژنان دەبوو. هیچ شەرم نییە! بەگوێرەی من ئـازادکردنی ژنـان و بەدەسـتهێنانی ناسـنامە و تەنانـەت جوانیەکەشـی و دیـاریکردنی سەوداسـەری بـۆی و هاوبەشـێتی و دابەشـکردنی ژیـان شـتێکی جوانـە. بـەڵام دووبـارە دەیڵێمـەوە" لەلایـەنی سـەرۆکایەتییەوە ئەمـە چـۆنە و، بابەتێکـە لەسـەری دەوەسـتین. بـەڵام هـیچ یـەکێك نـاخوازیٚ بـەبیری خۆشـیدا بێنێـت. دەرك پێکـردن و تێگەیشتنی ئەمە پێویست دەکات. نالێم هیچ پێشکەوتنێك لەئارادا نییە. گەلێك لەهـەڤاڵانمان سـەبارەت بـەم مەسـەلەیە قـاڵ دەبنـەوە. بیرکـردن و قووڵبوونـەوە لای پیـاوانیش هەیـە، ئەگـەر شـەڕێکی روون و ئاشـکرا نەبوایە، ئایا هێندەی کچی گـەنج بەدروسـتی و پتـەوی لەچیاکان دەمـان؟ زۆر بـەگرنگی لەسـەر ئـەم خاڵـە بوەستن. یەکێك لەهەڤاڵان باسی یادەوەریەکانی خۆی بۆ دەکردم، باسی شەهید "چیچەك"ی بۆ کردم، گوتی

کاتێ هەڤاڵ "چیچەك" شەهید بوو, فەرماندەیەکی سەربازی تورکیا چووە لای جەستەکەی" کۆنترۆڵی دەکات تاوەکو بزانێت "پاکیزەیە" یان نا, دەبینێ پاکیزەیە, دەڵێ ئەی چۆن سەرناکەون! هەشت ساڵە لەچیاکان لەنێو ریزی گەریلادایە و "پاکیزەیە," هەروەها دەڵێ ئەگەر لەیەکینەی من بوایە نەك هەشت ساڵ بەڵکو تەنیا لەهەشت کاتژمێردا چەندین سەرباز دەستدرێژیان دەکردە سەر ئەم کچە. یادەوەریەکی بەمجۆرەم لەبیرە. بێگومان لایەنی راستینەی خۆی هەیە. لێگەڕین دەکات و دەخوازێ بزانێ ئایا زۆربەی کچان هێشتا پاکیزەن یان نا. ئەمە هەڵوێستێکی گڵاوە. نەك تەنیا لەمێژووی کوردستان بەڵکو لەخۆرهەڵاتی ناوینیش ئەمە پەیڕەو دەکرێت. وابزانم ئەمە بوویەرێکی زۆر جددیە کە لەچیاکان و بوار و گۆڕەپانەکانی دیکەی ژیاندا ژنان بەبێگەردی بمێننەوە. هەروەها شکاندن و نەمانی گیانی دەستدرێژی و هێرشبەرانەی پیاوان پێشکەوتنێکی زۆر جددییە, بێگومان ئەمە لەئاستی ئەو پێشکەوتنەدا نییە کە دەیخوازین, ئێستا هیچ پیاوێك ناتوانێ لەمیانی جنێودان و هەڵوێستێکی جەستەیی نزیکی ژنان ببێتەوە. بەگوێرەی من ئەمە بۆ ژنان زۆر گرنگە. ئەوە زۆر گرنگە کە پیاو جنێو بەژنان نەدات و ژنانیش خۆیان لەژێر نیری زۆرداری نەهێڵنەوە. ئێستا لەنێو ریزەکانی پارتی و بەرەکانی شەڕدا مسۆگەر رەوش بەمجۆرەیە. بەڵام پێویستە بکرێت بەسیستەمێك, پێویست دەکات وەکو رەگەزێك پیاوانیش بخرێنە نێو پرۆسەی ئازادیەوە. بیر لەوە دەکەینەوە, هەڵبەتە جوڵانەوەی ئازادی ژن لەم پێناوەدا چەکێکی بەکاریگەرە. ئەگەر جوڵانەوەی ئازادی ژنان بەرەو پێشەوە ببەین, ئەوا پیاو لەخۆ رێکخستن و خۆ چاککردن بەملاوە ـــ هیچ بژار و چارەیەکی نامێنێ. بەکاریگەرترین چەکی پەروەردەکردن و چاککردنی پیاو و تەنانەت کردنی پیاو بەپیاوێکی راستەقینە و دەرخستنی لەڕەوشی پیاوی ساختە رێکخراوی جوڵانەوەی ئازادی ژنە. پێشخستنی ئەم چەکە و بەکاریگەرکردنی, بەتایبەتیش پێشخستنی پێوانە و بەرنامە و پرەنسیپ و بەها مۆراڵیەکانی دەکەوێتە ئەستۆی ژنان و رێکخراوی جوڵانەوەی ئازادی ژنان. ئەو کاتە دەبینین لەمە بەدواوە پیاو لەخۆ چاککردن و راست کردنەوە بەولاوە هیچ چارە و بژارێکی دیکەی نییە. لەم لایەنەشەوە هەڵوێست ئەمەیە" ئەوەی جوڵانەوەی ئازادی ژنان پێشبخات پیاو بونیاد دەنێتەوە. ئەگەر دەخوازن ئەم بێزاری و نیگەرانیەی بەرامبەر بەپیاوان هەتانە و گەلێك تایبەتمەندێتی گڵاوی پیاوان بەلاوە بنرێن خۆتان لەگەڵ رێکخراوی جوڵانەوەی ئازادی ژنان ئاوێتە بکەن. لەمیانی ئەم چەکەوە بجەنگن. بژار و چارەیەکی دیکە نییە. هەربۆیە ئەو ژنەی بڵێ هێندە بەرێکخستنی ژنان دڵخۆش نیم, واتای ئەوەیە تەواوی فشار و توند و تیژی پیاوانی بەسەر خۆیدا پەسندکردووە. ئەمەش گڵاوترین و بێناوەڕۆکترین کۆیلایەتییە. هەم سکاڵا سەبارەت بەپیاو دەکەیت و هەم لەهەمانکاتدا بیر لەرێگەی رزگاربوون لەپیاو ناکەیتەوە. بەگوێرەی من بێ رەوشتی هەرە مەزن کە بناخەی تەواوی بەد رەوشتیەکانی دیکەیە, ئەم بێ رەوشتییە یە. ئەمەیە هۆکاری هێندە وردەکاری و هەستیاری من. ئەگەر بێتو سەرلەنوێ ئەم پەیوەندییە رێکبخرێتەوە کە زەمینەی ئەم بەدڕەوشتییە مەزنەیە, ئەوا ئاستی رەوشتی کۆمەڵگا بەگشتی تا رادەیەکی مەزن پێشدەکەوێت, ئەو لایەنە بەهێزەی فشار هێنانی پیاوان لەبنەچەی خۆیدا بەرەو هەڵوەشانەوە ئاراستە دەگرێ ـ نەك تەنیا سەبارەت بەژنان, بەڵکو ئەوەی هەموو جۆرە دیکتاتۆرییەتێك بەسەر چین و نەتەوەکاندا پیادە دەکات, پیاوە ـ لەم چوارچێوەیەدا دەتوانین بڵێین

جوڵانـەوەی ژنـان جوڵانـەوەی ئاشـتی و دیموکراسـییە. جوڵانـەوەی ژنـان جوڵانـەوەی بـەواتاکردنی شـەڕ و ڕزگارکردنێتی لە بێ واتایی. بەڵام لەهەمانکاتدا جوڵانەوەی ژنـان لـەم پێنـاوەدا جوڵانـەوەی بانگـەوازیکردنی شەڕە. ئەگـەر تـەواوی ئەمانـە بگەیەنینـە یـەکتر و یـەکانگیریان بکـەین بۆمـان دەردەکـەوێت کـە ڕێکخـراوی جوڵانەوەی ئازادی ژنان دیاردە و بوویەرێکی چەندە سەرنج ڕاکێشە. هیچ شۆڕشێك ئەم مەسەلەیەی بەمجۆرە تاوتوێ نەکردووە. بەردەوام کێشەی چەوساوەکان بۆ ڕۆژی حیساب دواخـراوە, ئەمـە هەڵوێسـتێکی هەڵەیـە. بـەگوێرەی مـن تـاوتوێکردنی کێشـەی چەوسـاوەکان بـەر لەهـەموو کێشـەکانی دیکـە لـەجێگای خۆیدایـە و ڕاسترە, پێویستی قووڵکردنەوەی چالاکی و تێکۆشان سەبارەت بەم مەسەلەیە بەپێویست دەبینم. گروپێکی ژنان لەگەڵمدا دەبێت, من " زیلان"ەکانم ناچار نەکرد لەگەڵ مندا بن, زیلانەکان خۆیان ئەمەیان خولقاند, " سەما"کان خۆیان ئەمەیان نووسی و چالاکیەکانی خۆیان پێشخست. بەسەدان, بەڵکو بەهەزاران ژنـی ئـازاد و دلێری بەمجۆرە هەن. زۆربەشیان شەهید بوون. گرێدانی ئەوان و گرێـدانی مـن بـەوان گرنگـە. ئەگـەر هەنـدێ کەس بەرگەی ئەمە نەگرن و لێی تێنەگەن, من چی بکەم؟ مـن نـاڵێم مسـۆگەر دەبـێ ژن گرێـدراوی مـن بـێ, خزمەتێك لەئارادایە, ژن گرێدراوی ئەم خزمەتەیـە, هـەروەکو هەنـدێ کـەس مەزەنـدە دەکـەن و باسـی لێـوە دەکەن من کێشەیەکی بەمجۆرەم نییە کە بەشێوەیەکی جەستەیی هێـزی خـۆم نیشـان بـدەم. چـونکە ئەمـە بەشـتێکی زۆر سـادە و بچـووك دەبیـنم. بـەڵام کەرامـەتی ژن گرنگـە. ناسـنامەی ڕاسـتەقینەی ژن گرنگـە. لەڕاستیدا نەك وەکو مێرد یان لەسەر بنەمای هەڵوێستی پیاوی کلاسیکی, بەڵکو گرنگ ئەوەیە وەکو هەڤاڵێك لەگەڵیدا پەیوەندیدار بیت. ئێستاکە ژن زۆر بەباشـی لەمـە تێـدەگات. گـرنگترین لایـەن و تایبەتمەنـدێتی کـە ئاماژەی پێ بکەم, ئەمەیە. کاتێك سەبارەت بـەم مەسـەلەیە کەسـایەتی مـن هەڵدەسـەنگێنن, تەنانـەت هـیچ تەنگـەتاوی و شـەرمێکی بچووکیشـیان نـامێنێ. نزیکبوونـەوە و باوەڕییـەکی بـێ سـنوور هەیـە ــ ئەمـە لەزیلانەکاندا زۆر ئاشکرایە, "سەما"کان ئەم هێزەیان دەبینی ــ یاخود ئێمە بەمجۆرە خۆمـان بونیـاد نـاوە و پەروەردە کردووە, بێگومان ئەمەش بـەڕێزگرتن وەڵامـی دەدرێتـەوە. ئەگـەر ژنێـك بەشـێوازێکی بـێ سـنوور بخوازێ لەڕەگەز و زایەندی خۆیدا دابەشکردنێك ئەنجامبدات, لێرەدا گەلێك ئەنجام هەن کە پیاوێـك بـۆ خـۆی هـەڵیبهێنجێ, ژن لەسـەر بنـەمای ئـازادی بـەبێ سـنوور خـۆی دەسـووتێنێ. ئەگـەر بێتـو بـەئیرادەی خـۆی چالاکیەکی بەمجۆرە ئەنجامبدات کە نموونەکەی لەمێژوودا نەبینراوە, ئەمە زۆر واتادارە. بۆچی ژنێك تـا ئـەم ڕادەیە گرێدراوە؟ ئەگەر سەرەڕای هەموو جۆرە فشارێك ــ هەرچەندە خێزانتە و ڕۆژانە نازانم چی و چـی پـێ دەڵێیت ــ گرێدراوی تۆ نەبێت, بۆچی بەهەزاران کچی گەنج لێرەدا هەرهەموویان گرێدانێکی مـەزنی بـەمجۆرە نیشان دەدەن؟ هەڵبەتە ئـەوە لێـرەوە سەرچـاوە دەگرێـت, بەرلەهـەموو کەسـێك ئێمـە بەشـێوازێکی ڕاسـت خاوەن لەکەرامەت و ناسنامەی مرۆڤایەتی ژن دەرکەوتین ــ لەڕاستیدا ڕێزمان, بۆی هەیە. ژنـان لەبەرئـەوەی ئـەو پێشـکەوتنەیان تاڕادەیـەك لەئێمـەدا بـینی کـە سـەدان سـاڵە هیـوا و ئاواتیانـە, هەربۆیـە گرێـدانیان بەسەرۆکایەتی پێشکەوت, هەندێك کەس هەن لەمە تێناگەن. کەوتووترین ژنانی ژێر باڵادەستی پیاویش هەن. دژی مـن دەنووسـن. ئـەوان خۆیـان دەزانـن. بابنووسـن, پراکتیـك ئەمـە نیشـان دەدات کـێ تـا چ ڕادەیـەك بەهادارە. تەواوی ژنە دلێر و ئازاکان لەگەڵماندان. تەواوی ژنە جوان و مـەردەکان لەگـەڵ ئێمـەدان! هەنـدێك

کەس ژن یاخود پیاو, ئەمە هەرس نەکەن, من چی بکەم؟ باڤاوڕێك لەڕەوشی خۆیان بدەنەوە. بۆچی دەنووسن؟ بۆ وڵات دەنووسن یان بۆ ئازادی؟ ئایا شوێن پەنجەی جوانی و مەردایەتی لەواندا هەیە؟ بەپارە و تواناکاری کێ و چۆن دەگوزەرێن؟ چۆن و لەژێر ناوی کێ بێ ناوەڕۆکترین ژیان پێشدەخەن؟ پێویستە ئەم پرسیارانە لەخۆیان بکەن" رەخنەکردن و تاوانبارکردنی سەرۆکایەتی مەسەلەیەکی هێندە سانایی نییە. شەڕی تایبەتی شتێکی بەمجۆرە دەکات و من خەتاباری ناکەم. باشە باهەر بەردەوام بێت. سەبارەت بەژن پێویست دەکات شەڕی مەزن لەبەرچاو بگرن. هەندێ پێداویستییەکانمان ئەنجامدا, زیاتریش ئەنجام دەدرێ, مەسەلەکە ئەمە نییە. ئێمە کەرامەتی ژنانمان لەلا گرنگە. پێشکەوتنی ناسنامەی ژن بەگرنگ دەزانین, بەر لەهەموو شتێك ئەمە تاوتوێ دەکەین. ئومێدەوارم لەم چوارچێوەیەدا پیاویش شتێك تێبگات. دەشێ پیاوێك نەبم لەو جۆرەی کە باسی لێدەکرێت. وەکو کەسێتییەك دەشێ خاوەنی پێوانە کلاسیکییەکان نەبم و سەرۆکێکی بەمجۆرە یان یەکێکی بەمجۆرە نەبم کە باڵادەستی بەسەر ژندا پەیڕەو بکات و بەسەریاندا زاڵ بێت, دەشێ هەروەکو هەندێ کەس مەزەندە دەکەن سەرۆکی بنەماڵەش نەبم. هەروەکو دەزانن ئەم زاراوانە بەهەند وەرناگرم و بەگرنگیشی نازانم. دەشێ ژیانێکی ئەوەندە رەحەتیشمان نەبێت. بەڵام بەگوێرەی من ژیان لەگەڵ هێندە ژنە قارەمانانە لەهەموو شتێك بەهادارترە. لێرەدا جێگای هزری بچووك نییە. جێگای هزری بچووکی بەمجۆرە نییە کەبڵێ با ئەم ژنە هی من بێت. ژنیش بڵێت, ئەم پیاوە تا ئەم رادەیە هی من بێت. لێرەدا ئاوێتەبوون لەگەڵ شکۆمەندی و پەیمانێکی مەزن لەئارادایە, من ئەمە بە بەیەکگەیشتنی مێژوویی ناوزەد دەکەم. بەڵێ لەسەر ئەم خاکەدا ئەوە بەخراپی بەکار دێنن. دەخوازم نموونەیەك لەداستانی گلگامێش بێنمەوە, لەوێدا, لەکولتووری ئێمەدا ئەستێرە هەیە. عەشتار خوداوەندی ژنانە, خوداوەندی ئەشق و سەرکەوتنە. گلگامێش گەورەترین جەنگاوەرە, کەسایەتییەکە بەدوای ئازادیدا دەگەڕێت. لێرەدا بەیەکگەیشتنێك هاتە کایەوە. دەبێ ئێمە بتوانین ئەم بەیەکگەیشتنە بگوازینەوە بۆ رۆژگاری ئەمڕۆمان. دەتوانرێ بگوترێ ئەمە یۆتۆپیا و خەیاڵێکی زۆر مەزنە.بەڵام لەبەرئەوەی ئەم خەیاڵەمان لەدەست داوە ئێستاکە میزۆپۆتامیا بۆتە شوێنگەی مێروولە و مرۆڤە گرگنەکان ( بستە باڵاکان ). بەڵام گلگامێش رۆڵەی ئەم خاکە بوو. ئەستێرە, واتە عەشتار ناوێکە لەجوانی نراوە, هەروەها خوداوەندی ئەم خاکەیە, بۆچی شایستەی خۆمانیان نەبینین؟ بۆچی جەخت لەسەر گرگنی بکەینەوە؟ بۆچی بەئەندازەی خوداوەندێك نەبینە خاوەنی کەسایەتی ئەشق و سەرکەوتن؟ بۆچی هێندەی گلگامێش بەدوای نەمریدا نەگەڕێین. ئەگەر لێرەدا ژیان لەمردن خراپتری لێهاتبێت, خاك وێرانە کرابێت, ئەوا پێویستی بەهەست و هزر و ئەشقی پیرۆزی بەمجۆرە هەیە.

بەگوێرەی من ئازادی ژنان واتای زیندوو بوونەوەی ژیانە. من جۆش و خرۆش لەمە وەردەگرم, ناشێ بەشێوازێکی دیکە من بەجۆش وخرۆش بم. ئەم تێکۆشانە بۆ من تێکۆشانی ژنانە, بەیەکگەیشتنە لەگەڵ ژندا. ژیان لەگەڵ ژندا بەڕێوەچوونە لەگەڵ ژندا, هەڤاڵێتی و شەڕکردنە شانبەشانی ژن. دەشێ هەندێ کەس بڵێن: ئەمە کاروانی ئازادی و یەکسانییە, تێکۆشانێکە تەواوی ئەمانە لەخۆوە دەگرێت.

بانگەوازی بۆ هەر کەسێك دەکەم بەڕاستی و قووڵیی لەمە تێبگات و تەنانەت بەشی خۆشی لێوەربگرێت. ئەگەر باوەڕیان بەمن هەبێت و متمانەم پێبکەن و بخوازن ببنە کەسایەتییەکی پابەند بە سەرۆکایەتی و, بخوازن بەئێمە و پێوانەکانمان گرێدراو و پابەند, بن ئەوا پێویست دەکات لەئاستێکی بەرزدا لەگەڵ ئەم تێکۆشانە پەیوەستدار بن. لەوێدا دەتوانن ئەشق و سەرکەوتن و شەڕیش بدۆزنەوە.

لەڕاپۆرتی سیاسی سەرۆکایەتی بۆ کۆنگرەی دووەمی **PJKK**, وەرگیراوە

لەئایدیۆلۆژیای رزگاری ژندا,

تیۆری دابڕان

(( هەندێ کەس دەڵێن بۆچی تا ئەم رادەیە دابڕان؟ لەڕاستیدا ئەم دابڕانە, دابڕانە لەو ژیانەی کە لەڕێ دەرچووە. دابڕانە لەگەندەڵی و چەپەڵی. ئەم دابڕانە, دابڕانە لە نایەکسانی و دابڕانە لە خنکاندنی لەنێو ژیان.

دابڕانە لە هەر شتێك کە هەموو شتێکی گرێدراو بە دوژمنی تێدایە و هیچ شتێکی تایبەت بەمرۆڤی تێدا نییە. دابڕان لەڕاستییەکی بەم شێوەیە, دابڕانە لە شکست و بەفیڕۆچوونێکی وەها, دابڕانە لە گەندەڵ بوون و لەنێو چوون.))

ئەگەر لەبەرامبەر ئەو هات و هاوارە راوەستین کە خواوەندەکانی شەڕ لەدژی ئێمە بەڕێوەی دەبەن و, لەلایەنێکی دیکەوە بە ئازادی ژنەوەی گرێبدەین, ئەوا لەوانەیە بە شێوەیەکی ناکۆك دەربکەوێتەڕوو, بەڵام لەڕاستیدا ئەمانە ئەو مەسەلانەن کە پێویستە هەمیشە هەڵبسەنگێنرێت و شیبکرێتەوە. ئەگەر چاوێك بەڕابردوودا بخشێنینەوە ـ کە رابردوو بۆ ئێمە بنەمایەکە ـ ئەوا یەکێك لەژنە خواوەندەکانی میزۆپۆتامیا کە "عەشتارە" ـ ناوی "عەشتار" بەکوردی " ستارە " و بەواتای ئەستێرە دێت ـ ئەوا هەروەکو چۆن لەواتای ئەم وشەیەدا " عەشتار " دەردەکەوێت, خوداوەندی سەرکەوتنە.

عەشتار پەیوەندییەکی نزیکی لەگەڵ شەڕدا هەیە, ئەفسانەیەکی میزۆپۆتامیایە کە ئاوێتەی ژیانی ئێمە بووە, بەڵام واتا و گەوهەری خۆی بەتێپەڕبوونی هەزاران ساڵ لەدەست داوە. ئێمە دەمانخواست دووبارە ناوی بهێنین و بیخەینە بەر باس و لێکۆڵینەوە. بێگومان کەسایەتییەك هەیە بەناوی گلگامێش, کە ئاوێتەی ئەم ئەفسانەیە بووە, گلگامێشیش کەسایەتییەکە کە تایبەتمەندی بەرجەستە و جەنگاوەرانەی هەیە. کاریگەری ئەم ئەفسانەیە تاوەکو ئەمڕۆش بەردەوام دەکات. ئێستا, ئەگەر بتوانین بەشێوازێکی قووڵ و بنچینەیی و بە پشت بەستن بە لێتوێژینەوەیەکی سۆسیالیستانە, ئەمە هەڵبسەنگێنین, ئەوا دەتوانین پەیوەندییەکی نوێ لەنێوان ژن و پیاودا بخوڵقێنین و لەسەر ئەم بنەمایە ژیانێکی نوێ و کۆمەڵگایەکی نوێ بونیاد بنێین" ئەو سەرخان و ژێرخانەی کە خوازیارین بیخوڵقێنین, هەر ئەمەیە. ئەو ژیانەی کە دەمانخواست بەکەڵك وەرگرتن لەشەڕ بونیادی بنێین, ئەمەیە. پێویستە ئەوە بڵێین, کە بەگوێرەی بەرفراوان بوونی شەڕ, لەبونیادنانی ژیانێکی ئازاددا سەرکەوتوو دەبین, پێناسەی ئێمە بۆ شەڕ وەك هی ئەو کەسانە نییە کە

بانگەشەی ئەوە دەکەن و دەڵێن: ئێمە وردەبەردێکیش بەخۆڕایی نادەین." شەڕ لەلای ئێمە شتێکە کە بۆ مرۆڤ پیرۆزە و وەرچەرخانێکی مەزنە لەسروشت و جیهاندا. بە واتایەکی تر شەڕ, بینینەوەی بەهای گەیشتن بە ئازادی مرۆڤە.

ئەم بابەتە تەنانەت ئەگەر بەئەندازەیەکی کەمیش بێت, لە ئەفسانەکەی گلگامێش دەچێت. دەتوانرێ مەسەلەی جاویدانی, کە لەم ئەفسانەیەدا باسی لێوە کراوە ـ لە کردار و ئارەزووی ژیانێکی ئازاد لەگەڵ ژن لەلایەن گلگامێشەوە ـ کە لەشیعرەکانی گلگامێشدا بەدیار دەکەوێ ـ دەرکی پێبکرێ. چونکە لەم شیعرەدا, یان نەمری یان ژیان لەگەڵ ژندا پێشنیار دەکات. ئەگەر لەم رووەوە چاو لەو ئەفسانەیە بکەین, راست دەبێت. وەلێ ئەمە شەڕی هێز بوو. ئەو ئەفسانە و شیعرانەی لەنێو ئەودان بەم شێوەیە بەردەوام دەکات. واتە چەمکی ئەم شەڕە هەرچەندە بەشێوەیەکی لاوازە, بەڵام لەکوردستان و لەنێو کوردەکاندا رەنگدەداتەوە, هاوکات مەسەلەی مرۆڤ و مافی مرۆڤە کە ئێستا لەرەوشێکی نائاساییدایە. هەربۆیە سووربوون لەسەر چارەسەرکردنی کێشەی کورد, هەرچەندە لایەنێکی نەتەوەیشی هەبێت, وەلێ بەهەمان ئەندازەش لایەنی جیهانی لەخۆوە دەگرێت. بەمشێوەیە وێڕای پێداگری زیاتر لەسەر هەڵسەنگاندنی ئەم مەسەلەیە, گرنگییە جیهانییەکەی زیاتر دەبێت. پێویستە دان بەوەدا بنرێت, کە لەکەسایەتی مندا لێگەڕین بەدوای ژیان بەهێزە و لەژیانی مندا گەیشتن بەنەمری, روون و ئاشکرایە. وێڕای تێکۆشان خوازیارم بۆ پێکەوەنانی ژیانێکی باشتر, هەوڵ بدەم بە چ شێوەیەك بتوانم ژیان لەگەڵ ژندا بونیاد بنێم, ئەم چەمکە تا ئێستاکەش لەلای من وەکو خۆی بەهێزماوەتەوە. پێویستە بە باشی دەرك بەم مەسەلانە بکرێت.

کاتێ کە ئەمەم لە تەمەنی منداڵیدا بینی, پەسندم نەکرد. دەتوانم ئەوە دیار بکەم کە بەیەکگەیشتنی پیاو و ژن بە پلەی خنکاندن ناڕەحەتی بۆ من خوڵقاند. هەر ئەوکات ئەوەم بینی بوو کە پێویستە ژیان بەو جۆرە نەبێت. لەو رۆژەوە تاوەکو ئەمڕۆ لەبەرامبەر راستینەی ژن, خۆم وەکو تاکەکەسێکی ئازاد, پێداویستی خۆڕێکخستنم, وشیاری هەست و سۆزەکانم, لە کەسایەتیمدا بەرجەستە کردووە. بە کورتی دەتوانرێ نزیکبوونێکی وەها بکرێت کە گوایە لەسەر بنەمای شەرم کردن بوو, چونکە بەتایبەت خۆم دوور لەکارێك رادەگرت کە لەئەنجامدا ببێتە هۆی شکست. لەم لایەنەدا مەسەلەیەك کە دەبێ گرنگییەکی زۆرتری پێبدرێت, ئەم راستییە کە باسمان کردووە, ئەمە مەسەلەیەکی سادە و ساکار نییە. خوازبێنی ژن بەگوێرەی داب و نەریتەکانی کۆمەڵگا هەڵە بوو, چونکە شکستی لەگەڵ خۆی دەهێنا" هەربۆیە خوازبێنی بەم شێوەیە " گوناحە ", تەنانەت ئەوە بۆ من وەکو شکستێکی مەزن بوو لەژیاندا.

هەربۆیە بەلای منەوە ژن خواستن بەگوێرەی ئەم داب و نەریتانە, وەکو تاوانێکی مەزن بوو, بەلای منەوە وەکو شکستی ژیانێکی مەزن, دەهات. دەتوانم بڵێم لەم لایەنەوە بێجەسارەت بووم و سڵم لێدەکردووە. سەرەڕای ئەمەش لێگەڕینی من, بەردەوام بوو. زۆر بە باشی بیرم کردەوە لەسەر پێداویستی هەڵوەستەکردن لەسەر ئەم مەسەلەیە و پێداویستی ئەوەم بینی کە بەدوایدا بچم, چونکە کێشەیەکە تا دێت قووڵدەبێتەوە, وەلێ ئێستا ئەو ئاستەی کە پێیگەیشتووە, جیاوازترە. چونکە چ لەشێوەی ئەزموونی YAJK بێت, یاخود چ سەبارەت بە پێداویستی چۆنیەتی بەیەکگەیشتنی گەوهەری راستی ژن بێت, پێشکەوتنێکی مەزن هاتۆتە

ئاراوە و, ئەمەش بەلای منەوە وەکو سەرەتای خەباتێك, دێت. تەنانەت لەو رۆژانەدا کە شەڕ بەتوندی بەڕێوە دەچوو ـ وەکو ئێستا ـ خۆم لە مەسەلەی ژن بە دوور نەگرت. واتە دەخوازم ئاماژە بەپەیوەندی ژن و شەڕ بکەم لەکاتێکدا کە پیاو پەیوەندی بە ژنەوە دەبەستێت, رەوشێك دێتە ئاراوە کە ژن لەدەرەوەی شەڕ دەهێڵرێتەوە. تەنانەت دەگوترێ کە ئەفسەرەکانی تورك لە کاتی شەڕدا لەژنەکانیان دادەبڕێن. بە یەك نەگەیشتنیان بە ژنەکانیان و دابڕانیان لێی, بە تەواوەتی جوامێرییە. ئەم رەوشە سەبارەت بەئێمە یەکجار پێویستی بە دوور کەوتنەوە هەیە. وەلێ هەرچی لەبەرەی شەڕی ئێمەدایە, تائێستا دابڕانی یەکینەکانی ژن لەپیاو, لەسەربنەمای کەسایەتی ئازادی و بەئیرادەی ئازادی خۆی, لەمیانەی کێشەکانی ژیانی ئازاددا, رووبەڕوو ماوە و ئەمە جێگەی باس و خواسە. ئەم رەوشە ئێمە پەیوەندیدار دەکات و بۆ ئێمەش واتادارە. بە تەواوەتی گوزارشت لەواتای لێپرسینەوەیەکی شەڕ, دەکات. لێرەدا دەڵێین, پێویست دەکات بەمجۆرە بێت. تادوایی دەڵێین. کە پێویست دەکات ژن هەردەم بیر بکاتەوە کە دوژمنی کێیە, پیاوەکەی کێیە, سروشتەکەی کێیە و, چۆن چۆنیە و, هەروەها ژن لەمیانەی لێپرسینەوە, لەچیا سەخت و دژوارەکانی کوردستاندا تاوەکو سەر مۆخی ئێسقان هەست بەخۆی دەکات و دەتوانێ بیر بکاتەوە و ببیسێ. چونکە مسۆگەر, لەهەل و مەرجە سەخت و دژوارەکانی بەمجۆرەدا, پێویستی بە بیرکردنەوەیەکی مەزن هەیە و, ئەمەش رێگا لەپێش خستنەگەڕی ئیرادەی دەکاتەوە و هەروەها رێگا لەپێش ناسێنێ تایبەتمەندی خۆی دەکاتەوە.

لێرەدا دەخوازم بەڕاشکاوی ئەوە دیار بکەم کە, ئێمە بە وشیارییەوە ئەمە بەڕێوەدەبەین. وشیارکردنەوەی ژن و پێویستی بچووك نەکردنەوەی, رووداوێکی زۆر جددیە. هەندێ کەسی تا ئێستاکەش دەڵێن: بۆچی ئەم دابڕانە؟ بۆچی تا ئەم رادەیە دابڕان لەپیاو, بۆ ئەم پرسیارانە ئەوەی گرنگە کە ئاماژەی پێبکەین ئەوەیە کە: لەڕەوشی باڵادەستی ئێستاکەدا بچووکترین پەیوەندی بە پیاوەوە, رێگا لەپێش رەوشی فشار و چەوسانەوە, دەکاتەوە. یەکەم کار کە پیاو بیکات ئەوەیە کە سیستەمی بیرکردنەوەی تایبەتی ژن, لەناو دەبات و ئیرادەکەشی لەپەلوپۆ دەخات. ئێستا ئەم رەوشە زۆر مەترسیدارە. بۆیە پێویستە ئەم رەوشە بەلاوە بنێین. ئەگەر رێزمان بۆ ئیرادەی ئازاد, یاخود کەسایەتی ئازاد هەیە, ئەوا پێویست بە کەسایەتییەك هەیە کە تادوایی بتوانێت کە بە پشت بەستن بەخۆی, بیر بکاتەوە و بتوانێت خۆی بگەیەنێتە ئیرادەی ئازاد. ئێستا ئەمە لەلای ئێمە بە ئەندازەی رەوشتێکە و هاوکات یاخیبوونە. رەنگە ئەمە بۆ پیاو وەکو بێ رەوشتییەك بێت و, رەوشێك بێت کە نەتوانرێت پەسند بکرێ, وەلێ بەلای منەوە یاخود بەلایەنی ئەو دەزگا سەرۆکایەتییەی کە هەوڵمداوە نوێنەرایەتی بکەم, هەم پرەنسیپێکی ژیان و هەم خەباتێکی ژیانییە. جگە لەوە حەرامە! ئەگەر بەزاراوەیەکی ئایینی بیڵێین, ئەوا پەیوەندی بەستن لەگەڵ ژنێك کە ملکەچ بووە, مسۆگەر بێ رەوشتیە و حەرامە. وەلێ هەرچی پەیوەندی بەستنە لەگەڵ ژنێك کە لەهەوڵی ئازاد بووندایە و تادێت لەمیانەی ئەم مەسەلەیەدا خۆی وشیار دەکاتەوە" جا چ بەگوزارشتێکی وێژەیی بڵێین یان بەشێوەیەکی زانستی روونی بکەینەوە, ئەوا ئەمە پەیوەندیەکە رێگای یەکسانی گرتووە و پەیوەندییەکە ئەشق پێشیخستووە.

روونکردنەوە و تـاوتوێکردنی ئـەم زاراوە و دەسـتەواژانە, سـوودمەند دەبێـت. ئەگـەر سـەیری کۆمـەڵگای کوردەواری و بەتایبەت پێکهاتەی خێزانـی کـوردەواری بکرێـت, ئـەوا هـیچ ئاسـەوارێك بـەدی ناکرێـت کـەپێی بگوترێ ئەشق. بێگومان لەپەیوەندی هەر ژن ـ پیاوێك دا کاتێ کە ئەشق بـوونی نـەبێ یـاخود ئەشـق لـەنێو پەیوەندییەکاندا نغرۆ بووبێ, ئەوا بەهای خولّقکاری نایەتە ئاراوە و, هیچ پەیوەندیەکی راست و دروستی ژیان دەرناکەوێتە مەیـدان. پێویسـتە ئەمـە زۆر بـە باشـی دەرکـی پێکـرێ. ئەمـە تایبەتمەندیـەك نییـە کـە هـەروا رووکەشیانە دەرباز بکرێت. ئایا بۆچی لەسەر بنەمای رێزگرتن لەژیان, لـە ژن و تەنانـەت لەخۆمانـدا, تـا ئـەو رادەیە, دووربوون لەئەشق بوونی هەیە؟ ئەحمەدی خانیش لەداستانی " مەم زین " دا هزری بنچینەیی ئـەوە بوو کە خواستوویەتی لەکۆمەڵگای کوردەواریدا, لە پەیوەندی کورداندا, بگات بـە ئەشـقێك. دەخـوازێ ئـەوە بسەلمێنێ و وەلێ وەکو دەزانـین " مـەم و زیـن " دەسـووتێن و دەبـن بەخۆڵـەمێش و ئـەوەی دەیانخواسـت پێکنایەت. ئەم کێشەیە ئەو کاتیش گرنگ بوو. لـەرووی بیرکردنەوەشـەوە ئەحمـەدی خـانی مەلایەکـە. واتـە پیـاوێکی ئایینـە. باسـکردنی ئەشـق بـەمجۆرە لـە سـەردەمی ئـەودا, سـەرنج راکێشـە. دوای ئـەو سـەردەمە رەوشەکە زیاتر بەلایەنی خراپیدا شـکایەوە. لەمیانـەی پەیوەنـدی کـورددا رەوشـێك هاتـە ئـاراوە کـە تیایـدا ئەشقی نامۆ بوو و لەنێو چوو! وەکو هەموو کاتێك باسـی لێدەکـەم, بەداخـەوە, زۆر بەپێچـەوانەوە, کـرا بـە میکانیزمی بەرهەم هێنانێك کە هیچ ئامانجێکی تێدا نابینرێ. بەشێوەیەکی قەبـە گـۆڕا بـۆ ماڵێـك کـە لەگـەڵ لایەنی سێکسی, بووە بەرهەمهێنانی خێزان و منالّ دروستکردن. ئەمە زۆر مەترسیدارە. بۆچی دروسـتکردنی مندالّ؟! دروستکردنی مندالّ لەپێناو چ ئامانجێك؟ لەم رەوشەدا فەلسەفە نییە, ئامانج و رێکخستنی نییە. لە وڵاتەکەی لەئازادی دابڕاوە و ئەمەش بەتەواوەتی ئافاتێکە. سـەبارەت بـەژیانی کـورد و رووداوی کـورد ئەمـە ئافاتێکە و ئەم ئافاتەش ئەنجام دراوە. ئایا چۆن دەتوانین ئەم رەوشە بـەلاوە بنـێین؟ بێگومـان دەکـرێ بـە سەرلەنوێ بەدەستەوەگرتنی رووداوی ئەشق, ئەمە بەلاوە بنـێین. مـن تاڕادەیـەك هەوڵـدەدەم ئەمـە ئـەنجام بدەم.

ئەگەر بڵێین ئەمە چ پەیوەندییەکی بەشەڕەوە هەیە؟ هەڵبەتە پەیوەندیەکی تۆکمەی پێوە هەیە ـ هاوکات ئەو کەسایەتییەی کە بەڕاست و دروستی لەئەشق تێ نەگەیشتووە یاخود ئەو کەسایەتییەی کە بەشێوەیەکی بەرفراوان لێگەڕینی بۆ ئەشق بۆ پێوانەکان, ئامانج و خولیا, ئاوێتـە نـەکات, ئـەوا ئـەو شـەڕەی ئەنجامیشـی بـدات, کاولکاریـە. ئـەم کەسـایەتییە بـۆ دۆڕانـدنی شـەڕ لێهـاتووە و, ناتوانـێ سـەرکەوتن بەدەسـت بهێنـێ. دەسەڵاتداران کە دونیایەکی مەزنیان هەیە و, شەڕ بەرەوا دەبینن و پێداگری لەسەر درێژەپێدانی شەڕ لەدژی زوڵم لێکراو و داگیرکراوەکان دەکەن, هەوڵـدەدەن کـە دونیـای شـکۆمەندی خۆیـان زۆرتـر بڕازێننـەوە و بـەم شێوەیەش بژین.

ئەوان بەگوێرەی داخوازیەکانی خۆیان ئەشقێکیان هەیە. ئەمە لەڕاسـتینەی کۆمـاری تورکیـادا زۆر روون و ئاشکرا و بەرجەستەیە. ئەمڕۆ چینە سەردەستەکانی نێو کۆمەڵگای تورك وێـڕای ژن و منالّـەکانیان, ژیـانێکی ئاسوودە بەسەر دەبەن. سـەرۆك کۆمـار و چـینە سەردەسـتەکانی کۆمـەڵگا لەجـەژن و شـایی و زەماوەنـد و مارەبڕیندا بەشداری دەکەن. لەم میانەدا لە لایەك شەڕێکی توندوتیژ بەڕێوە دەبەن, وەلـێ لەلایـەکی تـرەوە

بەگوێرەی خۆیان کۆمەڵەی مارەبڕین, نیشان و ئەشقیش بەڕێوە دەبەن و ئاشکرایە کە تا چ رادەیەك ئەمە بەشێوەیەکی چڕوپڕ بەیەکەوە گرێدراوە.

پێویستە ئێمەش لەم بابەتەدا بێ ئەلتەرناتیف نەمێنینەوە. ئێمە تەنیا شەڕ بۆ کاولکاری یاخود لەپێناو بەدەست خستنی هەندێ دەسکەوتی ئابووری بەڕێوە نابەین. خۆی لەخۆیدا ئەگەر لەپێناو ئەم ئامانجە شەڕ بەڕێوە ببرێت, ئەوا ئەم شەڕە پەرەناسێنێ و سەرناکەوێت. ئەگەر شەڕ وەك ئامرازێك بۆ بەدەستخستنی ئەشق سەیر نەکرێت و بێگومان ئەگەر فەلەسەفە, ئیرادە, ئەستاتیك, ئەمە هەرس نەکات, ئەوا ئەو شەڕە پەرەناسێنێ. ئەم مەترسیە لە ریزەکانی ئێمەدا زۆر لەپێشدایە, هەربۆیە لە کاتێکدا کە زاراوەیەکی وەکو ئەشق پێشدەخەین, دەخوازین لەبنەمادا شەڕ واتادار بکەین. چونکە شەڕێکی واتادار شانسی سەرکەوتنی هەیە. ئێستا دووبارە پێویست دەکات بەشێوەیەکی باش دەرك بەرووداوی کورد بکرێت, ئەو رووداوەی کە پێی دەگوترێ" مردنی ئەشق " بۆچی پیاوە مەزنەکان پێش ناکەون؟ بۆچی ژنە مەزنەکان پێناگەن؟ چونکە لەپەیوەندیدا ئەشق مردووە. لەپەیوەندییەکدا کە ئەشق تێیدا مردبێت, ئەوا کەسایەتییەکی تۆکمە و پتەو پێش ناکەوێت و, ژن و پیاوێکی دروست دەرناکەونە مەیدان. لەلایەنی زانستیشدا ئەمە بەمجۆرەیە.

ئێمە نەك بۆ فەنتازیا و خۆدەرخستن, بەڵکو تادوایی بە لەبەرچاوگرتنی بنەما زانستییەکان دەڵێن: " مسۆگەر پێویست دەکات پەیوەندیەکان و رەهەندی ئەشق پێشبخەین " چونکە بەگوێرەی داخوازی بەتەواوەتی پێشکەوتوو نین. وەلێ سەرەڕای ئەمەش جۆش و خرۆش دەوروژێنێ. هەر لەئێستاوە سەرەڕای تەواوی زۆر و زەحمەتییەکان, لەمیانەی پێشکەوتنی ئەم هزرەدا, سەرەتا بۆ ژنان گوزارشتی بەرجەستەیی خۆی لە YAJK دا دەدۆزێتەوە. ئەگەر لەسەرەتادا ئەم قۆناخەیان بە زۆر و زەحمەتی بینی بێ, ئەوا ئێستا وەکو جەسارەتێکی هەرە مەزن و خەباتێکی بەجۆش و خرۆشی دەبینن.

لەرەوشێکدا کە پیاو هەڵدەهات, لەرەوشێکدا هەر رۆژ پیاو هەڵدەهات, ئەوا ژنی هەلاتوو, بەڵکو هێندە کەمە, تەنانەت پێویست بەگوتنیش نەکات. ئەگەر ئێستاکەش هەندێك زیاتر وشیار ببێت, ئەوا بەپێی ئەم فەلسەفەی ژیانە, لەو باوەڕەدام کە لەمیانەی گرێدانی ژن بەوڵات و هەروەها گرێدانی بەژیان, لەتوانایدا هەیە زۆر زیاتر پیاو دەرباز بکات. هاوکات ئەمە لەگەڵ خۆیدا رێگای قازانج کردنی پیاو دەکاتەوە. ئێستا ئەم چالاکیەی پێشمان خستووە, لەسەرەتادا دابڕانێکە لەژن و لەپیاو. هەندێ کەس دەڵێن بۆچی ئەمەندە دابڕان؟ لەڕاستیدا ئەم دابڕانە, دابڕانە لە گەندەڵی و چەپەڵی, دابرانە لەنایەکسانی. دابڕانە لەنغرۆبونی ژیان, لەوانەیە لەناوەڕۆکیدا هەرشتێکی تایبەت بە دوژمن هەبێت, وەلێ تایبەت بە مرۆڤ هیچ شتێك نییە. دابڕانە, لەڕاستینەیەکی بەمجۆرە, لەشکست خواردن و لە لەنێوچوون و بەفیڕۆچوون.

میزۆپۆتامیا سەرچاوەی ژیانە, لانکەی مرۆڤایەتی بوو. دابڕانێکی بەمرەنگە, لەڕاستیدا تێکۆشانە بۆ لەناوبردنی شێوەیەك لەژیان کە واتا و چەمکی مرۆییانەی نییە. دابڕان لەو ژیانە, ئەو جۆش و خرۆشە لەگەل خۆیدا دەهێنێ کە لەسەرەتای شارستانیەتدا هەبوو. ئەم دابڕانە دەرفەت بۆ خولقاندنی ژیانێکی دەرەخسێنێ کە شایستەی مرۆڤ بێت. لەو باوەڕەدام تا دەچێت دەرك بەمە دەکرێت. هەروەها پەی بەوەش دەبرێت کە تا چ رادەیەك ژیانییە و ناکرێ دەستبەرداری لێ بکرێت. لەڕاستیدا دەکرێ نزیکبوونی زانستییانەی بەمجۆرە

وەکو تایبەتمەندی هەرە سەرەکی کارەکتەری شۆڕشەکەمان ببینرێ و پێویستە کەسایەتییەکان بەگوێرەی ئەمە خۆیان ئامادەبکەن.

بێگومان ژن وێڕای دابڕان, دەرك بە سەرکەوتن دەکات. دەرك بەلایەنەکانی ئەم خۆدۆزینەوەیە دەکات. هۆکاری هەڵوەستە کردنی ئێمە لەسەر YAJK تا ئەم رادەیە و بەپێداگرتنەوە, بۆ ئەمە دەگەڕێتەوە. هەم لەپرەنسیپدا, هەم لەهەڵسوکەوت و هەم لەهەست و سۆز, لەهزردا تەنانەت لەنوێ بوونەوەی هەبوونی فیزیۆلۆژیدا, تادوایی بەڕادەی هەست کردن بەئازادی خۆی, لەژیاندا بڕیاری خۆی, دەدۆزێتەوە. ئیدی وەکو رابردوو ئەو پەیوەندییە نامێنێ کە پیاو خۆی, یاخود لەڕێی هێزی بەڕێوەبەرایەتی, یان بەو توانست و زەمینەی کە کۆمەڵگا پێی بەخشیوە بۆ نزیك بوون لەژن, هەڵخەڵەتاندنی ئەو, چەوساندنەوەی ئەو, لەمیانەی بەکار هێنانی هێزی باڵادەستی, لەچوارچێوەی ئیرادەیەکی یەك لایەنی پێشیخستووە, پرەنسیپی هەرە بەرچاوی ئێمە ئەمەیە. ئێمە ئەوە هەم مەترسیدار و هەم یەکجار لەدەرەوەی رەوش, دەبینین. بۆ شرۆڤەکردنی پرەنسیپی ئازادی و یەکسانیش, پێچەوانەی دەبینین.

لێرەدا گەلێك ئەنجام دەردەکەوێتە مەیدان. ئەگەر هەرکەسێك پابەندی ئەم پرەنسیپە بکەین, ئەوا هێزێکی بێ سنووری ژن دەردەکەوێتە مەیدان. بۆ نموونە هەرەدوایی, لەدوای خۆسووتاندنی " سەما یوجە " هەڤاڵمان لەماوەی 88 رۆژدا هەندێ لەو نامانە هەیە کە نووسیویەتی. سەرتاپای گیانی سووتا بوو, سووتاندن زۆر ئازار دەبەخشێ. سەرەڕای ئەمەش دەڵێ:" خۆشترین و بەچێژترین رۆژانێك لەژیاندا, لەم ماوەیەدا بەسەرم برد. هەروەکو پێش ئێستاش هەوڵماندا باسی لێبکەین, ئەمەش لەژێر ئەم زاراوانە بەڕێوە دەچێ. بۆ نموونە لەلایەنی مۆراڵیدا, گوایە کاتێ کە لێی دەپرسن مۆراڵت چۆنە؟ لەجوڵانەوەیەکدا کە نیشانی دەدات تا چ رادەیەك بەها مۆراڵیەکانی بەرزە, دەڵێ: گوتنی مۆراڵت چۆنە, هەم بێ واتا و هەم نزیکبوونێکی باش نییە.

مرۆڤێك کە تا ئەم رادەیە لەنێو ئێش و ئازارە, ئەگەر لەهێزی ژوور مۆراڵەوە لێی بڕوانین, ئەوا دەبینین کە تا چ ئەندازەیەك ژنی ئازادی بەهێز کردووە و بەڕاستیش هەستی بەهیچ ئێش و ئازارێك نەکردووە. بەهێزی نائاسایی خۆی ژیانێکی ئازاد, کەسایەتییەکی خۆڕاگر, بەشێوەیەکی سەرسووڕهێنەر, دەخولقێنێ. لەو باوەڕەدام لەکاتێکدا ئەو بەرەو شەهیدبوون دەچوو نەیتوانیوە مردنێکی سادە و ساکار پەسند بکات و مردنێکی هەڵبژاردووە کە شیاوی ئەو بێ. ئەمە رووداوێکی جددیە, چونکە لەکاتێکدا کە لەنێو ئێش و ئازارێکی مەزندا بوو, بەپابەندبوونی تا ئەم ئەندازەیەی بۆ ژیان, ئاخافتنی سەرنج راکێشی گوتووە و, بەخشینی دواهەناسەی, رووداوێکی هەروا رووکەشیانە نییە, چونکە وریایە. کارەکان لەم خاڵەدا راستەڕێی خۆیان دەگرن.

لەو بڕوایەدام ئەم چالاکیە پیاویش ناچاری گۆڕانکاری دەکات و رەوشێکە کە ناچاری دەسەپێنێ. لەم بابەتەدا پێشتریش ئاخافتنێکیان کرد بوو, ئەویش مردنی پیاوی کلاسیکە. ئەگەر مردنی پیاوی کلاسیك ئەنجام نەدرێت ئەوا رێگای ئەشق ناکرێتەوە. ئێستا ئەمە کارێکی زەحمەتە, وەلێ هەروەکو چۆن ژیانێکی بێ ئەشق, ژیان نییە, ئەمە هەر لە عەشتارەکانەوە زۆر گرنگە, واتە لەڕاستیدا نەمری بە واتای ئەشق بۆ ژیان

دێت. هەربۆیە ئەگەر بخوازین ژیانێکی وەها بەدەست بخەین, ئەوا پێویست دەکات ئەشق بخولقێنین. بەم پێیە ژن لەڕەوشێکی هەستیاردایە و پیاو لەهەلومەرجێکی خراپتردا دەژی, وێڕای ئەمەش بانگێشەی ژیانیان هەیە. پێویستە ئەم رەوشەی کە لەمردن خراپترە, هەڵبسەنگێنرێ و وازی لێ بهێنرێ.

بۆ ئەوەی بتوانین بە ژیانێکی راست بگەین, نابێ بە گوتنی وەك: " ژیان تێکۆشانە "ئیدی واز لەم مەسەلەیە بهێنین. نابێ ئێستا باس لە شەڕی ژیان بکەین و هەروا بەسادەیی بەسەریدا دەرباز بین, چونکە لەکۆتاییشدا هەموو شتێك لەپێناو ژیاندا بەخت دەکرێت. لەلای ئێمە ( واتە لەلای کوردان ) ژیان بەهادارە, بەواتای ئەگەر ژیانێکی ئاوێتە بە ئەشق مردبێ, ئەوا ئەوەی کە پێویستە بیکەین ئەوەیە کە ئەحمەدی خانی ئەنجامی دا, ئایا دەکرێ ئەشق بخولقێنرێ یان نا؟ ئەگەر بخولقێنرێ, ئەشقێکی چۆن دەبێت؟ لێرەدا پێویست دەکات زۆر بەئاشکرا بگوترێ کە, ئەشق وەکو گەلێك کەس بیر لێدەکەنەوە, بە یەککەیشتنێکی سێکسی نییە. تەنانەت لەوباوەڕەدا نیم کە زێدە بتوانن بە یەککەیشتنی سێکسی مەیسەر بکەن.

پێویست دەکات لەسەر ئەوە بدوێم کە دیمەنێکی من هەیە هەزار جار کۆماری تورکیا بەکاری هێناوە. لەڕاستیدا من لەکاتێکدا هەستم بەمە کرد کە لەبەرامبەر کۆمەڵێك ژنان قسەم دەکرد. واتە هەستم بەوە کرد کە رۆژێك دێت کۆماری تورکیا ئەم فۆتۆگرافە یان ئەم دیمەنە پەخش دەکاتەوە. ئێستا کۆماری تورکیا گوایە دەخوازێ بە نیشاندانی وێنەی من بەجلی ژێرکراسەوە, ئەوە بسەلمێنێ کە گوایە تا چ رادەیەك کەسێکی کرێت و قەبەم. هەڵبەتە دەتوانن رووپەلەکانی مێژوو بکەنەوە و سەیر بکەن, کە لەسەردەمی کلاسیکی رۆما و یۆناندا, جوانترین ژن و پیاو لەپەیکەرەکاندا بەرووت و قووتی رازێنراوەتەوە و لەڕاستیدا شتێکی جوانە! سەیری پەیکەرە رووت و قووتەکانی ئەو سەردەمە بکەن کە هەریەك لەوانە پەرستگایەکی جوانین. وەلێ گوایە لەو باوەڕەدان بە نیشاندانی وێنەیەکی بەمجۆرە ئێمە بچووك دەکەنەوە, تورکیا کۆمەڵگایەکی وەها محافەزەکار و بێ رەوشتە کە بە بڕیاری لەپێشینەی خۆی, ناتوانن جوانی و ناحەزی لەیەکدی جیا بکەنەوە.

بڕوانن ئەمەیە راستی کۆماری تورکیا. ئەگەرچی گەلێك جار باس لەپێشکەوتن و عیلمانیەت دەکات, وەلێ هیچ واتایەك نابەخشێت بە پرەنسیپێکی ئەستاتیکی. واتە دەیتوانی بەرووت و قووتی من نیشانی مرۆڤەکان بدات. ئەمە رێز و بەهای من کەم ناکاتەوە! چونکە بەها, رووت و قووتی نییە. چونکە ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە چ شتێك لەهەناویدا هەیە و واتای ئەمە چییە؟ هەڵبەتە ئەگەر هەوڵیان بدایە لەمە تێبگەن, ئەوا تۆزێك راست و دروست دەبوون. ئێستا زاراوەی زۆر مەحافەزەکار و رووکەشانە و تا بڵێی زۆر مەترسیداری بەمجۆرە هەن. ئەگەر پیاو رووتیش بێت چ سوودێکی هەیە, یاخود ئەگەر هونەرمەندێکی زۆر قەشەنگ و رازاوە جلوبەرگی تەواویشی پۆشیبێ, ئایا دەتوانێ بگوترێ ئەمە پیاوێکی جوانە؟ لەکاتێکدا تۆ ( مەبەست تورکیایە ) هەر رۆژ سووکایەتی بە ژن دەکەی, هەر رۆژ لەژن دەدەی, مافی مرۆییانەی لێ زەوت دەکەی, منداڵەکانی بەخێو ناکەی و تەندروستیان لەناله‌باری دایە, کەچی رەوایی بەخۆت دەدەی! ئەگەر سەیر بکرێ ژنەکانتان بەشێوەیەکی جوان وقەشەنگ پرچی خۆی شانە کردووە, بەشێوەیەکی بەڕێز و حورمەت دانیشتووە, وەلێ ئەمانە هەمووی لەناوەڕۆکدا فاشیستن. لەهەمانکاتدا ئەمانە ئێمە بەڕێوە دەبەن, شەڕ بەڕێوە دەبەن. ئەمانە چ پەیوەندییەکیان بە مرۆڤایەتییەوە هەیە؟

راستینه ( واقع ): رووت و قـووت بـوونی خۆشـدەوێ، دەبـا بەڕاسـتینەکانی خۆیانـەوە بـەڕووت و قـووتی دەربکەونە مەیدان، ئەوا دەبینین کە لەنێو مرۆڤایەتیدا لەنێو چ رەوشێکی شـەرمەزرایدان. هەربۆیـە بێگومـان من لەڕەوشێکدام کە دەبێ خۆم بخولقێنم. رێزگرتنی من لەژن، خولقاندنی کەسایەتییەکە کە لە لایـەن ژنـەوە پەسند بکرێ. ئەوەی جوان و راستیە، ئەمەیە. ئێستا دەسەڵاتم هەیە و، هێزیشـم یـەکجار زۆرە. بـەو هێـزەی کە هەشمە هەرگیز وەکو دەسەڵاتدارەکانی تورکیا ناجولێمەوە، بۆ نموونە لەمێژوودا لـەقۆناخی، سـەڵتەنەتی عوسمانییەکان تەنانەت لەقۆناخی هەر پێنج خەلیفەی ئیسلامی، یاخود قۆناخی ئەمەوییەکان ـ عەباسییەکان ژیانێك هەیە، مەحاڵە من بتوانم ژیانێکی وەکو ئەوانە پێشبخەم. هەروەها شێوازی ژیانی ئاغاکانی کورد هەیە" ناکرێ ژیانێکی وەکو ئەوانە پەسند بکرێ. سەرنج بدەن ئێمـە ئـەم جـۆرە ژیانـە پێـك نـاهێنن، ئەمـەش نـەك لەبەرئەوەی تواناکاری ئەمەمان نییە، بەتەواوەتی بە پێچەوانەوە، لەکاتێکدا کـە توانسـتەکان یـەکجار زۆرن، وەلێ بەتوندییەوە سڵ لەو جۆرە ژیانە دەکەینەوە. تەنانـەت هەڵسـەنگاندنێکی بەمجۆرەشم هەیـە کـە، ئایا ئەگەر ببمە خاوەن هێز و دەسەڵات، مەترسی لەدەستدانی ئەشق هەیە، یان نا؟ من بەردەوام ئەم پرسـیارەم لەخۆم کردووە. چونکە لەرووداوی ئەشقدا، ئەگەر بە پشت بەستن بە دەسەڵات، هێـز، بـە تایبـەت بـە هێـزی سیاسی و سەربازی، خۆت بە مرۆڤەکان بە پەسندکردن بدەیت و مرۆڤەکان ملکەچی خۆت بکەیت، ئەوا ئەمـە تـا دەچـێت بـەرەو زەمینـەی ناهـەقی و گـڵاوی، هـەنگاو دەهاوێـژێت. کەسـایەتییەك ئەشـق پـەیڕەو بکـات، کەسـایەتییەکی قارەمانـە. کەسـایەتی قارەمـان" ئـەو کەسـایەتییەیە کـە بەگەوهـەر و بەهونەرمەنـدی خـۆی دەجولێتـەوە و شـەڕ دەکـات. ئەمـە زۆر گرنگـە. خواسـتم ئـەم پرەنسـیپە سـەرەتا بـۆ خـۆم، هـەروەها بـۆ PKKش وەکو پێوانەیەك ببینرێ. لەرووداوی ئەشقدا، چ بۆ پیاو بێت یـان بـۆ ژن هـیچ جیاوازییـەکی نییـە، ئامانجە بنچینەییەکان هێنانە ئارای قارەمانێتییە.

بۆ نموونە کاتێ کە وڵات دەبێتە جێگای باس، ئەمڕۆ تەواوی کوردان کەوتوونەتە نێو رەوشـی کۆچـبەری، ئەوکەسانەی کە وڵاتی خۆیان بەردەدەن و نرخی پێنابەخشن، جوامێر نین. پێویستە گەلەکەمان لە ئەوروپا و شارە گەورەکان لەو تێڕوانینەی من دڵگیر نەبن، چونکە بێگومان لـەداهاتوودا ئـەوان بـەدوای وڵات و ئازادیـدا دەگەڕێن. بەم شێوەیە جودابوونەوە لەوڵات هیچ قازانجێکی نییە و پێویستە دەرك بەمـە بکـەن و بگەڕێنـەوە وڵاتی خۆیان، ئەوکات دەرك بە گرنگی ئەمە دەکەن و ئەنجامی گرنگ بەدەست دەخەن. واتە ئەگـەر بخـوازن لەبەرامبەر ژنەکانیان و خێزانـەکانیان گوزارشـت لـە بەهایـەك بکـەن، یەکـەمین ئـەرك کـە پێویسـت دەکـا بـە زووترین کات ئەنجامی بدەن، گەڕانەوەیە بۆ ئازادی و ئـەو خاکـەی لەدڵیانـدا جێگـەی گرتـووە. ئەگـەر ئەمـە نەبێت، ئەوا پیاوێتی ئەم پیاوە و ژنێتی ئەم ژنە لەئاستێکی زۆر کەوتوودایە و بۆیان ناکرێـت کـە ئـەنجامێکی زێدە بەدەست بخەن. ئەگەر پێوانەکانی قارەمانێتی قەبەی خۆمان دەربخەینە مەیدان، ئەوا ئەمە وەکـو ئـەم دەستەواژە بەناوبانگەیە کە دەگوترێ " ئەگەر مرۆڤێك دەست لەجێگایەك بەر بدات، ئەوا چۆلەکەش هێلانەی خۆی تێدا دروست ناکات. " هەڵبەتە پێویست دەکات ئەم گوتەیە بۆ مـرۆڤ لەچـۆلەکەیەك زیـاتر نـرخ و بـەها لەخۆوە بگـرێ. بـۆ کەسـێك کـە هـەموو شـوێنێکی داگیرکـراوە و بـەخودی خـۆی و مێـژوو، خـاك، ئازادیشـی بەتەواوەتی نامۆ کراوە، تەنانەت بۆ کەسێك لەبەرامبەر ئەمە دەرخراوەتە دەرەوە، ئایا هێندەی چـۆلەکەیەك

ئاسايی بوون ( سروشتی بوون ) لەئارادا هەیە؟ لەکاتێکدا کە هەموو لایەنێکی گڵاو کراوە, پێشکەوتنێك نایەتە ئاراوە. بەڕاستیش ئەمە رووی نەدا. راستینەی خێزانی ئێمەش ( واتە خێزانی کوردەواری ) لەبەر چاوانە. ئایا لێرەدا زاراوەی مەزنایەتی هیچ گرنگییەك لەخۆوە دەگرێ؟ کەواتە دەبێ ئاستێکی ئازادی وەها بەدەست بخرێت کە دەستێکی بێگانە نەگاتە هێلانەکەی واتە خاکی دایکی, ئەگەر ئەمە بەدەست نەخرێت, ناکرێ پەیوەندی راست دروست بێت. وەلێ ئەمە لەلای کورد بوونی نییە و کورد ئەمەی لەبیر کردووە. ئەگەرچی بەهانای ناموسیەوەیە, بێ ئەوەی چاوی خۆی بنووقێنێ لەپێناو ژنێکدا پیاویش بکوژێ, ئەوا ئەمە ناکۆکییەکی زۆر مەترسیدارە. چونکە ئەمە زۆر پێچەوانەی چەمکی نامووسە. راستتر بڵێین: ئێمە بەمە ناڵێین چەمکی ناموسی واتادار. ئەوەی نامووسی هەیە, ئەوا هەرەکەم دەبێ لەم خاڵەدا بە ئەندازەی هەڵوێستی چۆلەکەیەك بێت. بۆچی تۆ هێلانە لەشوێنێك دروست ناکەیت کە دەستی هیچ بێگانەیەکی پێنەگات؟ ئایا تۆ بە ئەندازەی چۆلەکەیەکیش نابێت؟ هێلانە دروست کردن لەشوێنێکی ئازاد واتادارە, وەلێ رەوشێکی بەمجۆرە لەئارادا نییە. بەڵێ لەلای مرۆڤی کورد ئەمە بوونی نییە. هەربۆیە ئەمە رەوشێکە کە دڵگیرمان دەکات. لەڕووی زانستیشەوە ئەم رەوشە بەمجۆرەیە. بۆچی ئەمڕۆ لەنێو دەوڵەتە زلهێزەکانی ئەوروپادا پەیوەندیە راست و دروستەکان پێشدەکەون؟ چونکە ئەوان کەم ـ زۆر ئاستێکی ئازادیان هەیە و لەنێو ئەم ئاستە ئازادیەدا پەیوەندیە راست و دروستەکانیان پێشدەخەن, ئەی بۆچی لەلای ئێمەدا ( واتە لە لای کوردان ) هەموو شتێك ناکۆکە و لەشێوازی خۆشەویستی کوێرانەیە؟ هەندێ جار سەیر دەکەی, ئەو کەسەی کە زۆریش ژنەکەی خۆشدەوێت وەلێ چەقۆی لێدەدات, ئەمە بە تەواوەتی رەوشێکی نەخۆشیە و هیچ لایەنێکی باشیشی نییە کە بەرگری لێبکرێت. بە تایبەت لەلای ئێمەمانان, لەو هەل و مەرجەی کە ئێستا ژن تێیدایە, بەستنی هەر پەیوەندییەك لەگەڵیا بەواتای ئەشکەنجە دێت. ژنێك نییە لێی نەدرابێت و فشاری نەخرابێتە سەری و تووشی سووکایەتی پێکردن نەبووبێتەوە. تەواوی تێڕوانینەکان و نزیکبوونەکان, بەمجۆرەیە. بەتایبەت لەنێو خێزانیشدا لەبەر ئەوەی پیاو, ژن بەموڵکی خۆی دادەنێت, بۆیە لەم رەوشەدا تەسەروفێکی بێ سنوور لەسەر ژن هەیە. ئەمە رەوشێکی زۆر مەترسیدارە و بێ رەوشتییەکی زۆر مەزنە و 99٪ لەکۆمەڵگای کوردەواریدا زاڵ و باڵادەستە. ئەگەر رەخنەیەکی جددی لەم رەوشە نەکرێت, ئەوا ناکرێ رێزی ژیان و ژن بەدەست بخرێ و ئەمەش زۆر روون و ئاشکرایە. ئەوانەی کە هەندێك لەسۆسیۆلۆژیا تێدەگەن, دەتوانن بە ئاسانی ئەم رەوشە دەستنیشان بکەن. هەربۆیە ئەم شەڕە, شەڕێکی هەروا سادە نییە. لەکاتێکدا کە تەواوی ئەمانەم ئەنجامدا, ئایا لەتوانامدایە من خۆم بگەیەنمە ئاستێکی پەیوەندی بەمجۆرە؟ هیچ شوورەیی تێدا نییە, ئەمە بۆ تەواوی پیاوەکانمان, بگرە بۆ تەواوی مرۆڤەکانمان پێشنیار دەکەم کە لەخۆمان بپرسین, ئایا چ لایەنێکی من هەیە کە پەسند بکرێت؟ ئایا لە پرەنسیپەکانی پەسندکردنەوە بگرە تاوەکو پێوانەکانی ئەستاتیکی, کام تایبەتمەندی پێکدەهێنم؟ پێویستە ئەمانە لەخۆمان بپرسین. پێویستە مرۆڤەکان بۆ خۆمان نەکەینە ئامرازی ئەم ئەشقە, ئەشقێك کە بوونی نییە, ئەگەر هەشبێت, کوشتنی هەندێ لەهەست و سۆز و نیازی پاکە. ئەمە هەم شێواندنی پەیوەندییەکانە بەشێوەیەکی ترسناك و هەم بەهێزکردنی پەیوەندییەکانە. ئەمانە زۆر گرنگن.

ئەگەر بخوازین پەیوەندییەکی بەهێز بخولقێنین، ئەوا پێویستە مسۆگەر ئەمە شیبکەینەوە. ئەگەر نموونەیەکی دیکەش بێنینەوە رەنگە ئەم مەسەلەیە باشتر دەرکی پێبکرێ. لەنێو ریزەکانی ئێمەدا هەندێ پەیوەندی هەن کە دەرکەوتوونەتە مەیدان، بەواتایەکی کلاسیکی، هەندێك هەن حەوت ساڵە لەنێو شەڕدایە، لەساڵی حەوتەمیدا لەگەڵ کچێك یان لەگەڵ پیاوێك کەم ــ زۆر لەنێو حەزێکی دیاریکراودا دەژین، کەچی لەدوای ئەم حەوت ساڵە بەرگەناگرێ و کاتێ دەرفەتی بۆ برەخسێ لەنێو پارتی رادەکات. بەدەیان نموونەی لەمجۆرە هەن. لەمیانەی شیکردنەوەی ئەم رەوشەدا، لەڕاستیدا ئەوەی دەردەکەوێتە روو رەوشێکی رووڕەشیە! بێگومان ئەگەر ئەم پەیوەندیە لەسەر بنەمای ئەشقێکی راست بوایە، ئەوا نەك دەبووە هۆی راکردن لە هەست و سۆزەکان، بەڵکو بەرەو خۆشەویستی مەزنی وڵات و خۆشەویستی ئازادی و بەدەستخستنی ئەمەی دەبرد و مسۆگەر راکێشی نێو ئەمەی دەکرد، ئایا ئەمە چ پەیوەندییەکە، کە یەکسەر بەرەو راکردن پەلکێشیان دەکات؟ پەیوەندی بەمجۆرە سووکایەتی ( حەقارەت )ێکی مەزنە کە لەیەکدی دەکەن. چۆن دەتوانرێت ئەم پەیوەندییە پەسند بکرێت؟ لەتەواوی راکردنەکانی کورددا ئەم رەوشە لەئارادایە. تەواوی ئەو پەیوەندییانەی لەچوارچێوەی ماڵدا سنوور بەند کراون، لەبنەمادا بەواتای راکردنێك دێت. پیاو لەهەر لایەنێکەوە ژن سنووربەند دەکات و دەڵێ لە 100٪ موڵکی منە. لەڕاستیدا ئەم راکردنێکە و لەوێدا نەك هێز، بەڵکو بێ هێزێ دەردەکەوێتە مەیدان و لەناو چوون هەیە. پێویستە زۆر بە روون و ئاشکرایی ئەمە ببینرێ. ئەمە پەیوەندی بەناموس نییە. ئەگەر ژن دەرفەتی بۆ برەخسێت، یەکسەر رادەکات. لەتوانایدا هەیە مێردەکەی بەجێ بهێڵێ و بۆ لای پیاوێکی دیکە رابکات، بۆچی؟ چونکە ئەشق لەئارادانییە. ئەو شوێنەی ئەشق هەبێت، راکردن نابێت. لێرەدا دەپرسم ئەگەر پیاوەکانانتان ئەوەندە بەهێزن و ئەوەندە پابەندی ناموسیانن، باشە چ کاتێك پەیوەندییەك بەدەست دەخەن کە راکردنی بەدواوە نەبێ و چ کاتێك ژیانی ئەبەدی بەدەست دەخەن؟ ئەگەر ئەمە بوونی نەبێت ئایا مرۆڤ دەتوانێ ئاسوودە بێت؟ ئەمە گرنگە. لەم خاڵەدا ناموس گرنگییەکی مەزن لەخۆوە دەگرێت. پێویستە کەسایەتییەکی وەهات هەبێت کە، تەواوی گەل، بێ سنوور تۆیان خۆش بوێت و تەواوی مرۆڤەکان و ژنەکان و پیاوەکان بێ سنوور تۆیان خۆش بوێت. لەم نێوەندەدا بەهای پەیوەندی تاکەکەس دەردەکەوێتە مەیدان. ئەوکات کێ، کێی خۆش بوێت ئەمە بەهادارە. پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی بەمجۆرە، بەڕاستی پێکهێنانی یۆتۆپیاکانە. ئەمە شتێك نییە کە نەتوانرێ پێکبێت! بە پێچەوانەوە، بێ ئەمانە ناکرێ ژیان بەسەر ببرێت. لەبەر ئەوەی ئێمەی کورد لەم یۆتۆپیایە بەتەواوەتی دابڕاوین، بۆیە ژیانمان لەدەستدا. من بەڕوونی دەڵێم کە تاکو ئێستاش لەوانە دەترسم" جا ئایا پێی بڵێم ژیانێکی بە ژن بوو، ژیانێکی بوون بە مەیمونە، ئەشقی گرگنەکان، تەنیا دەکرێ ئەم رەوشە بەمجۆرە زاراوانەوە هەڵبسەنگێنم. پێویستە ئەم رەوشە تێبپەڕێنین. لێرەدا جوامێری خۆی نیشان دەدات. لێرەدا ئەوەی کە دەبینرێ" پەیوەندی بە ئاسانی نابێت و ژنی سادە یاخود پیاوی سادە جێگەی نابێت. بۆچی نابێت؟ چونکە پێویستی بەشەڕێك هەیە. بۆ سەرکەوتن لە شەڕیشدا، پێویست بەخولقاندنی ئەشق دەکات و ئەمەش رەنجێکی یەکجار زۆر دەخوازێت. پێویستی بە مێشك و وشیاریەکی پڕ لەڕەنج و پراکتیکێکی شەڕ، دەکات. هەروەها پێویستی بە جوانی هەیە. بەئاشکرا ئاماژە بەمە دەکەم کە،

من تەنیا دەکرێ بەگوێرەی پێوانەکانی شەڕ و جوانی لەژن نزیك ببمەوە. لەدەرەوەی ئەمە، رۆحی من ، بە بێ هیچ دوو دڵییەك تەنانەت یەك چرکەش چییە، کۆیلەیەك نزیکی خۆی ناکاتەوە. من ئەمە بە لەبەرچاوگرتنی ئاستی ئازادی گشتییەوە، دەڵێم، لەواتای " من منی " دا ناڵێم. ئەگەر ئێمە رێزمان بۆ کەسایەتی خۆمان هەبێت، ئەوا ناچارین ئەم پێوانانە بسەپێنین و لەکۆمەڵگادا پێکی بهێنین، چونکە کۆمەڵگای ئێمە بەشێوەیەکی گشتگیر لەم بوارەوە هەژار و نەدارە. بەکورتی، گوتمان دەبا مۆدێلێکی بچووکی چارەسەریش هەبێت، بۆیە رووداوی ئەم YAJK مان پێشخست.

ئێستا نۆرەی پیاوە. لەسەرەتادا هەندێك ئەمەم روون کردەوە. هەروەکو چۆن، دەسەڵاتدارەکان دەڵێن: " سەرەتا لە ژن بدەن " ئەوا لەسیستەمی ئێمەشدا زاراوەی لەشێوەی " سەرەتا ژن رزگار بکەن یاخود رزگاری ژن " هەیە. بەڵام گرێدراو بەمە رەوشی هاتنەوە سەرخۆی پیاویش، دەردەکەوێتە مەیدان. ئەگەر ژن بە تۆکمەیی رێکبخرێت و هێزی خۆی لەپرەنسیپ و پێکهێناندا دەربخاتە مەیدان، ئەوا مسۆگەر پیاو دێتە سەر رێگای راست. پێم وانییە هێزێکی بەمجۆرەی ژن، زێدە پشت بە پیاوەکان ببەستێ. لەوانەیە پیاوان بخوازن فێڵبازی بکەن وەکو رێوی لەدەورووبەری بسووڕێتەوە، وەلێ لەدوای ماوەیەك هەندێ لەراستینەی تێدەگەن و لەبەر ئەوەی بۆیان ناکرێ لەدەرەوەی ئەمەدا خۆیان بژێنن، بۆیە ناچاری بڕیاردانی ژیانێکی بنچینەیی، یاخود بڕیاری گۆڕانکاری دەبن. لەم خاڵەدا ژن پێوانەکانی پەسندکردن ــ رەتکردنەوەی خۆی و وەڵامدانەوەی پرسیاری چۆن بژین، دەسەپێنێ. بێگومان، پێویستە بەئەندازەی " عەشتار " بەرگە بگرێ.

دابەشکردنی دەسەڵات، دابەشکردنێکی سۆسیالیستییە. بەکورتی لەبەرچاوگرتن و پێشبینی کردنی دابەشکردنێك بەگوێرەی پێوانەکانی ژن سەبارەت بە گشت بەهاکانی، لەڕاستیدا بناخەی بەدەستخستنی ئەشقە. پێم وایە، لێرەدا شانسی وەرچەرخانی پیاویش دەردەکەوێتە مەیدان تەنیا لەگەڵ ژنێکی بەمجۆرە پێشکەوتوودا، دەشێ ژیان واتادار ببێت. ژیان لەگەڵ شێوازی عەشتار، نەمری، ژنی ئازاد، ژیانە. ئەمە گەیشتنە بە ئامانج. ئێستا شەڕی ئەمە بەڕێوە دەبرێت. ئەگەرچی زۆر و زەحمەتیش بێت، وەلێ پێویستە بەڕێوەی ببەین، لەدەرەوەی ئەمەدا ژیان بۆ ئێمە نییە، ژیانێکی دەرەوەی ئەمە، لەمردن خراپترە. واتای هەوڵ و کۆششەکانی ئێمە، ئەمەیە.

یەکێ لە خەباتە هەرە گرنگەکان کە پارتیمان پێکیهێنا، خولقاندنی پارتی ژنی ئازادە. کاتێ کە دەڵێین پارتی ژنان، پێویستە بە هەڵە تێنەگەین، پارتییەکی بەمجۆرە PKK خۆیەتی و پارتی ئازادی و رزگاری ژنە و ئەمەش گەلێك واتادارە و، پێشکەوتنێکی مێژووییە. هەر نوێخوازییەك تاڕادەیەك پێویستی بە رووخانی سنووری ئەخلاقی و سیاسی سەپێنراوە بەسەر کۆمەڵگادا. ئێمە ئەمەمان لەبەرچاوگرتووە و دەرئەنجامیش کەسایەتییەکی وەك " زیلان " دەرکەوتۆتە مەیدان. پارتیمان PKK سەلمێنراوێکی مەزنە بۆ چۆنێتی بوون بە پارتییەکی ژنان و زەمینەیەکە، کە پارتی ژنی شۆڕشگێڕی تێدا هەوێن بکرێت. بەکارهێنانی زاراوەکانی ئایدیۆلۆژیای ژن، شۆڕشی ژن و پارتی ژنان، زیانێکی نییە. چونکە ئایدیۆلۆژیای ژن، شۆڕشی ژن و پارتی ژنان هەر بەتەنیا شرۆڤەیەکی رەگەزی نییە. ئێمە رەگەز ناکەینە سەنتەرێك. ئەمانە هەر یەك زاراوەی کۆمەڵایەتی لەخۆوە دەگرێ و پێویستە بەمجۆرە هەڵبسەنگێنرێ. ئێمە لەسەر ئەم بنەمایەیە کە PKK وەك

خاوەن ئایدیۆلۆژیای رزگاری ژن دەبینین. دەتوانین وەك شۆرشی ژن یان وەك پارتی ژنان بیر بکەینـەوە. بـۆ نموونە YAJK بە تەنیا پارتییەکی ژنانە. زۆر بە ئاسانی دەتوانێ خۆی بگەیەنێتە هێزێکی پـارتی و خـۆی رێکبخات و, دەشبێ خۆی رێکبخات. دەتوانێ چالاکی خۆی دەربخاتە مەیدان و ئەمەش هـیچ زیـانێکی نییـە. PKK تادێت دەتوانێ بەتەواوەتی ببێتە پارتییەکی ژنان. واتە پارتی ژنانی کرێکـارانی کوردسـتان. ئەگـەر پیاوان هەولّ و تەقەلا نەدەن, تەمبەڵی بکەن, ئەوا ژنان دەتوانن پارتی بەدەست بخەن.

بێگومان ئێمە بەشێوەیەکی دادپەروەرانە هەڵسوکەوت دەکەین. کێ بەباشی خەبات بکـات و کـێ بەباشـی ببێتە وەلّام, ئەوا پارتی دەبێتە هی ئەو. لێرەدا جیاوازی رەگەزی ئەوەندە گرنگ نییە. لەکاتێکدا کە دەکرێ کەوتن و رابوونی رەگـەز لـەبوارەکانی کۆمەلآیـەتی, سیاسـی و تەنانـەت لـەبواری سەربازیشـدا دەسـتگۆرکێ بکرێ. ئەگەر ئێوە ئەنجامی نەدەن, پیاوەکان ئەنجامی نەدەن, ئەوا ژنەکان ئەنجامی دەدەن. خۆی لەخۆیدا من هەندێك زیاتر پێشیان دەخەم چونکە پیاوێکی بەمجۆرە نابێتە وەلّامی هیچ شتێك.

هـەروەکو ئامـاژەم پێکـرد ئەمـە سـەرەتایەکە و پێدەچـێ لـەگۆرەپانی نێونەتەوەییشـدا کاریگەرییەکـەی دروست بێت. جولانەوە فەمینیستە جیاجیاکان. زێدە شانسی ئایدیۆلۆژیای ژن و رزگاری ژنیـان نییـە, وەلـێ پارتی ژنانی ئێمە کێشەکان بەشێوەیەکی زۆر رادیکالآنە و لەسەر بنەمای یەك رەگەزی رووت و رەها و لەسەر بنەمایەکی فێمینیستی, بەدەستەوە نـاگرێ. پـارتی ژنـانی ئێمـە لەگـەلّ هەڵسـەنگاندنی مەسـەلەی رەگـەزی تـەواوی ئامانجـە کۆمەلآیـەتی و سیاسـییەکان لەچوارچـێوەی پێداویسـتییە کۆمەلآیەتییەکانـدا بەدەسـتەوە دەگرێ. لە سەر ئەم بنەمایەش هەوڵدەدات ئایدیۆلۆژیایەك, رێکخستنێك و جێگە و پێگەیـەکی زۆر بـەئیرادە, بەدەست بخات. دەشێ وەك زاراوەیەکی نوێ دەربکەوێتە روو, وەلێ پێم وایە ئەمە گـەلێك پێویسـتە. ئـەمرۆ ئاشتی و پاراستنی ژینگە زۆرتر دەکەونە بەرباس و خواس, بۆیە لەکۆمەلّگایەکدا کە بە پشـت بەسـتن بـەپیاو گەندەلّ بووە و چەمکی فاشیستیانە زۆر بووە, ئایـدیۆلۆژیای رزگـاری ژن بـۆ بـەرفراوانکردن و خسـتنە واری کـرداری ئاسـتی و پاراسـتنی ژینگـە و خولقانـدنی کۆمەلّگایـەکی بـێ شـەڕ, رۆلێکـی بنچـینەیی دەگێـرێ. بەدڵنیاییەوە هەم باوەڕیمان بەمە هەیە و هەم وەها بیر دەکەینەوە کە لەسروشتی رزگاری ژندا, ئەمـە بـوونی هەیە. هەربۆیە لە بەرەو پێشەوە بردن و بەرفراوانکردنی, دوو دلّ نین.

هەروەکو لەسەرەوەش ئاماژەمان پێکرد, لـەرۆژانی ئـەم شـەڕە گەرمـەدا, هـەروەکو چـۆن ئـەوان ( واتـە کۆماری تورکیا ) هەر رۆژ بـیر لـە چـۆنیەتی بارانـدنی موشـەك و بۆمبـا دەکەنـەوە, ئـەوا ئێمـەش, بـیر لـەوە دەکەینەوە کە چۆن وەکو بۆمبا, ژیان بەسەر ئەواندا ببارێنین. پێویستە بیر لەوە بکرێتـەوە کـە لـەلای ئێمـە ژیان و شەڕ بەم ئەندازەیە لەنێو یەکدیدان و ئاوێتەی یەکتر بوون. هەروەها پێویستە بـیر بکەینـەوە کـە ئـەم شەڕە بۆ ژن و ژیانـە. ئـەو هەنگاوانـەی کـە هـەڵمان هێنـاوە وەکـو سـەرەتایەکە. لەگـەلّ رووخانـدنی گـەلێك سنووری ئەخلاقی و سیاسی سەپێنراو بەسەر کۆمەلّگادا, لەڕاستیدا ئەمـە بـۆ ئێمـە زۆر پێویسـتە. پێویسـتە گەلەکـەمان, پیاوەکانمـان و ژنـەکانمان هەولّبـدەن بەشـێوەیەکی راسـت و دروسـت لێمـان تێبگـەن. ئێمـە دەخوازین بە شێوەیەکی زانستی لایەنی فەلسەفە و مۆرالّ, کە بەسـەدان سـالّە گـەلی کـورد لەدەسـتی داوە, سەرلەنوێ بەدەست بخەینەوە, چونکە بێ فەلسەفە و بێ مۆرالّ, ژیـان نابێـت. پێویسـتە ئەمانـە بـە دەسـت

بخەین. پاشماوە نابەجێکان ئێمەی کۆت و بەند کردووە. هەندێ تایبەتمەندی هەن ئیدی چ لەنێو خێزاندا بێت و چ لەنێو کۆمەڵگا بێت, پێویستە بیڕوخێنین. بگرە هەندێك کەس دەخوازن ئەمانە چەواشە بکەن. پێویستە ئەوانە هەندێك فێری ڕێزگرتن بن و پێویستە هەندێك لێتوێژینەوە بکەن لەوەی کە ئێمە چیمان بەئامانج گرتووە. من لەگەڵ ژن, لەگەڵ ڕەگەزی ژن, لەگەڵ فیزیۆلۆژی ژندا چۆن دەژیم, نەخێر, نەخێر لێرەدا بەراستی ئەمە بە روون و ئاشکرایی دەڵێم کە: لەڕەوشێکی وەهادا نیم کە تاوەکو بەیانی لەئامێزی ژندا یاخود تاوەکو بەیانی بخەوم و ژنێك لەباوەشمدا بێت و شتی بەمجۆرەش رووی نەداوە. من بانگەشەیەکی وەهام هەیە کە ژن لەهەر لایەنێکەوە جوان بکەم. خەریك بوونێکی وەها بەژنەوە لەلای من بەها و نرخێکی هونەری هەیە و ئەم کۆششەش هیچ شوورەییەکی تێدا نییە.

پێویستە بەباشی دەرك بەمە بکرێت کە, خولّقاندنی جوانیەك لەکۆمەڵگای کورددا کە زۆر چەپەڵکراوە, بە تایبەت لەژنی کورددا, خۆی لەخۆیدا بەها و نرخێکی گرنگ لەخۆوە دەگرێت. لەئایینی ئێمەشدا ( واتە ئایینی ئیسلام ) زاراوەیەك هەیە کە دەگوترێ " سەیرکردنی جوانی, خێرە "و دەشگوترێ کە ئەمە " حەدیپ " ێکی پێخەمبەرە (واتە حەزرەتی موحەمەد.) کەواتە لەمە گرنگتر خولّقاندنی جوانی مەزنترین خێرە و ئەمە لەدژی ئایینیش نییە. دەبێ ئەمەش دیاری بکەین کە پێخەمبەر خۆشی بەجوانییەکانەوە پەیوەندیدار بووە. لێگەڕینی پێخەمبەر ( حەزرەتی موحەمەد ) بۆ جوانی وایکرد کە لەبەستنی پەیوەندیدا, 40 ژنیش دەرباز بکات. من لەمە تێدەگەم. مسۆگەر لەم بابەتەدا من پێخەمبەر بچووك نابینم و بگرە بەها و نرخی پێدەدەم من لەو بڕوایەدا نیم کە ئیسلامییەکان یاخود موسڵمانەکان بەشێوەیەکی راست و دروست لەمە تێگەیشتبن. ئەوەی لێرەدا ئەنجامدرا, مەزنکردنی ژنە لەکۆمەڵگایەکدا کە ژنی بە بێ نرخ دادەنا و تەنانەت تەواوی منداڵە کچەکانیان زیندەبەچاڵ دەکرد.

بێگومان ئامانجی سیاسیشی هەیە. بەڕاستی تایبەتمەندیەکی بەمجۆرەی بەهەند وەردەگرم. هەروەها ئامانجی بەهێزکردنیش هەیە و هاوشێوەی ئەو " حەرەمانە " نییە کە لە دوایدا سەڵتەنەتەکان پێشیان خست. پێم وایە کە پێویستی بە هەڵسەنگاندنێکی بەمجۆرەی پارتی پێخەمبەر و پارت ژیان هەیە. من بەتایبەت ئەمە بۆ ئەوە دەڵێم چونکە هەندێ ناوەند هەن کە پێیان وایە بە بەکارهێنانی ئایینی ئیسلامی و ئایین لەدژی ئێمە ئەنجام بەدەست بخەن. ئەمانە بۆ روونکردنەوەی ئەم مەسەلانە دیاری دەکەم.

کەمالیستەکان هەموو کات هەندێ شت دەڵێن و خوازیارن لەڕێی وتەکانی خۆمانەوە ریسوامان بکەن, دەبێ ئەوان لەبەرامبەر مستەفا کەمالدا ڕێزیان هەبێ, چونکە ئەویش هەندێ تێکۆشانی سەبارەت بە ژن هەیە. ئەگەرچی مستەفا کەمال پەیوەندی خۆی لەگەل ژنان و کچانی و منداڵان نیشاندا بوو, وەلێ بەگوێرەی من زێدە سەرکەوتنی بەدەست نەهێناوە. بۆ نموونە "سابحە گوکچەن "ێکی کردووە بە فڕۆکەوان و لەڕێی ئەودا دێرسیمی بۆردومان کردووە. بەڵام لەلایەکی دیکەشدا " کەریمە نادیر " ێك هەیە, پێم وایە کە ئەودەکاتە شاژنی جوانی. واتە یەکێکیان باش و ئەویتریشیان خراپ. پێویستە خاوەندارێتی بکردایە لەوەی کە باشە و, لەخراپەکەش خاوەندارێتی نەکردایە. ئێمە لێرەدا لەهەڵپەی ئەوەدا نین کە کەمالیزم تاوانبار بکەین, وەلێ پێویستە سەرنج بدرێتە سەر لایەنە یەکجار میلیتاریست و مەترسیدارەکانی. ئێمە تەنیا ئەم

هەوڵ و تەقەلایە نەك بۆ رووداوی كورد، بەڵكو بۆ پێشكەشكردنی هاوكاری كولتووری ئەنادۆڵ، پێشدەخەین. ئەنادۆڵ كولتوورێكی زۆر دەوڵەمەندی لەلایەنی ژندا هەیە. من دابەشكردن بەشێوەیەكی هاوبەش، بەگرنگ لەقەڵەم دەدەم. لەڕاستیدا دەمانخواست ئەم گفتوگۆیانە لەناوەندێكی ئاشتییانەدا زۆر بە باشتر، پێشبخرایە. بۆ پێكەوە ژیان لە ئاستێكی پێشكەوتوودا پرۆژەكانی یۆتۆپیا هەیە. بەڕاستی زۆرمان دەمانخواست ئەمانە لەچوارچێوەی ژیاندا پێكبهێنین. وێڕای ئەمەش باوەڕیم بەوە هەیە كە هێزی پێكهێنانی ئەمەمان هەیە.

هەندێك كەس دەخوازن ئێمە وەك تیرۆریست و وەك هێزێك كە زۆر شەڕ پێشدەخەن، ناوزەدمان بكەن. ئەوانەی وا هەموو هیواكانی ژیان لە ناودەبەن، جوانییەكانی ئەو ئاستەنگ دەكەن و بەشێوەیەكی زۆر تێكدەرانە و تەنانەت دەتوانم بڵێم: بە بێ ئامانج ئەم شەڕە دادەسەپێنن، لەبنچینەدا ئێمە نین. ئەگەر ئەوان شەڕیان دانەسەپاندبایە، ئەوا لەگۆڕەپانی ئاشتی ئێمەدا بەتایبەت لەرەهەندی ئەشقدا، بەپشت بەستن بەمێژوو و كولتووری گەلەكەمان، بەشێوەیەكی زۆر سەرنج ڕاكێش، دەوڵەمەندمان دەكرد و دەرمان دەخستەڕوو. وێڕای ئەمەش هیواكانمان بەهێزە و هەرگیز دەستبەرداری لێ ناكەین و زیاتر بەهێزی دەكەین.

لەواتایەكدا ئەم شەڕە، شەڕی بە دەستخستنەوەی سەرلەنوێ خولڤاندنەوەی هەم ئەشق و هەم ژیانی خۆمان و ژنەكانی خۆمانە. بەڕاستی شەڕی بەدەستخستنی ناموسە. مسۆگەر پێویستە بەئیرادەیەكی مەزنترەوە خۆمان تەڤلی ئەم شەڕی بەدەست خستنە بكەین. مسۆگەر پێویست دەكات بەئەندازەی نواندنی بوێری بۆ ئەشق ئەو رەنجەی كە بۆ ئەو بۆتە پێداویستییەك، واتە رەنجی تێكۆشان، نیشان بدەن.

بەگوێرەی من ئەو رەنجەی كە بۆ زەمینە خۆشكردنی پەرەپێدانی خەباتەكانی ژنان و هەرلایەنێكی ژن، نیشاندەدرێت، بەنرخترین رەنجە.

ئێمە لەم قۆناخانەی دواییدا ئەمە پێشدەخەین. بۆ زیاتر ئەنجامگیر كردنیشی، هەوڵ و تەقەلا دەدەین. بەتایبەت پێویستە سەرجەم ژنانمان ئەم راستییە ببینن، بۆ نیشاندانی وەفاداری خۆمان بە ژنان، دایكان و كچانی لاو كە لەماوەی ئەو شەڕە ماڵوێرانكەرە كە لەدژی زوڵم لێكراوەكان بەڕێوە چوو، زیانیان بینی و هەروەها بۆ بەخشینی واتەیەكی مەزن بە ژیانی ئەوان و بەخشینی مافەكانیان، شەڕێكی وەها بەڕێوە دەبەین. تەنیا بەم شێوەیە دەتوانین سەبارەت بەكچان و دایكانمان مافیان پێبدەین.

لەدەرەوەی ئەمە باوەڕناكەم زێدە بتوانرێ مافی دایكانمان، كچەكانمان بدرێت. هەر لەم چوارچێوەیەشدا، بێگومان ئەوەی بڵێ من قارەمانم، بڵێ من بەناموسم و تەنانەت ئەوانەی دەڵێن ئێمە پیاوی قارەمانین، ئەوا گەلێك كاری گرنگ هەن كە پێویستە ئەنجامی بدەن. پێویستە بەوشیاری و هەستیارییەكی مەزنەوە لەم شەڕەدا بەشدار بن پێویستە لەبەرامبەر گەلە زوڵم لێكراوەكەمان و گرنگتر لەمە لەبەرامبەر ژنان كە زوڵمێكی زیاتریان لێكراوە، دڵنزم بن و لەرزگاری ئەواندا بەشداری بكەن. بۆ بەڕێوەبردنی ئەركێكی وەها بانگیان دەكەین. هیوادارم ئەم شەڕە بۆ گەلەكەمان، بۆ تەواوی مرۆڤایەتی و لەمەش گرنگتر بۆ ژنان، لەژێر دروشمی " ژنی سەركەوتوو، گەلی سەركەوتوو و ئازاد و وڵاتی سەركەوتوو و ئازاد " بەسەركەوتن بگات. هەروەها بۆ نیشاندانی وەفاداری و بەخشینی نرخێكی سیمبوڵی، لەیادی هەڤاڵان " زیلان و سەما " ئەو تێكۆشانە

بەرفراوان دەکەین. بەم بۆنەیەوە سڵاویان لێدەکەین و بۆ زیندوو راگرتنی بیرەوەری ئەوان زیاتر خەبات دەکەین و لە 100٪ سەردەکەوین.